زنجیرە کتێبی گۆڤاری کۆچ
ژمارە (١٠)

لێکۆڵینەوەی ئەدەبی -عیرفانی

# دەیری عیشق

## کاتێک ناخی مرۆڤ دەدوێ

لێکۆڵینەوەیەکی گشتییە لە چەمکی عیشق
لە شیعرەکانی مەحوی دا

عەبدوڵڵا قەرەداغی

٢٠١٢

ناوی کتێب: دەیری عیشق ... کاتێك ناخی مرۆڤ دەدوێ
بابەت: لێکۆڵینەوەی ئەدەبی -عیرفانی
نووسەر: عەبدوڵڵا قەرەداغی
تایپ: نووسەر
دیزاینی ناوەرۆك: حیکمەت مەعروف (ئالین دیزاین)
دیزاینی بەرگ: ئارام شوانی
نۆبەتی چاپ: یەکەم
تیراژ:
چاپخانە:
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرێتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (      )ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێدراوە.

**سوپاس و پێزانینم بۆ:**

- بەڕێز ئارام شوانی کە دیزاینی بەرگی کرد.

**دیارم دەیری عیشــقە، جیٚ، بە ســووتن بیٚ، لەویٚ دەگرم**
**کە من مشتیٚ چڵٚ و چیٚوم، بە چی بم.. کەڵکی کیٚ دەگرم؟**
**نەگەییـە دامەنی دەســـتی، دوعا، جـا دەبمە خاکی ریٚـی**
**طە ریقە ی گۆشەگیری بەردەدەم، ئەمجـارە ریٚ دەگرم**
**کە دادی یەئســـی خۆمم بردە لا، ئەم عارفـــە توند بوو**
**وتی: ئاخر ســــبەینیٚ جەژنە، خـــویٚنی تــۆ لە پیٚ دەگرم**
**لە رووسـووریی عیبادەت لام و رووزەردی خەجاڵەت مام**
**بە نـاوی ســیٚوی نـــاوم، بـــاغەوان، و من بەهیٚ دەگرم**
**لەســـــەرخۆ چوونە، شــەیدا بوونە، قورپیٚوانە، سووتانە**
**هەتـــا مردن، مەحەببەت ئیشی زۆرە، ریزی لـــیٚ دەگرم**
**چ شــــۆخە، ئاگرم تیٚ بـــەردەدات و پیٚمدەڵیٚ: یـــا شیٚخ**
**بە خاشاکی دەوت: شـوعلە عەصامە، دەستی پیٚ دەگرم**
**کە ســـینەی ریٚشمی، بەو تیری نازە، ئەنجن ئەنجـن کرد**
**وتی: پەژمـــوردەیـــە ئەم لالـــەزارە، ئـــاوی تیٚ دەگرم**
**لە پاداشی قسـەی سـەردا، هەمە ئاه و هــەناسەی گەرم**
**کەســــــیٚ شیٚتانە بەردم تیٚ گریٚ، من بەرقـــی تیٚ دەگرم**
**شـــــوکر هوشیارە " مەحـــوی "، تیٚ دەگا دنیا خەراباتـە**
**کە بەدمـــــەستی بکا، ئـــەهلی، خــراپەی بۆچی لیٚ دەگرم**

٤ م / ل ٢١٧ تا ٢٢٠

نـەك هـەر لـەم غەزەلـە، بـەڵكو لـە تێكـڕای غەزەلەكانیـدا، "مەحوی" پەیڕەوی لە ڕێبازی عیشق دەكات، ئـەوەی لـە بـواری صۆفیگەریدا بە "عیشقی حەقیقی" ناسراوە، بۆیە ئەگەر بمانـەوێ داكۆكی لەو جۆرە پۆلێن كردنە بكەین، بـە مەبەسـتی سـەلماندن، ئــەوا، لــە ســەرەتاوە، خۆمــان دەخەینــە داوی "هەوڵــدان بــۆ سەلماندنی سـەلمێندراو"ەوە. ئـەم قەناعەتـە ناچـارم دەكـات لـە سەرەتاوە، تەنها ئاماژە بۆ ئەوە بكەم كە مەحوی، لە چوارچێوە گــشتییەكەدا، درێژەپێــدەری ئــەو ڕێــچكەیەیە كــە پێدەچــێ سەرەتاكانی ڕەنگڕشتن و پێكهێنـانی بگەڕێتـەوە بـۆ قوتابخانـەی عیشقی هیندۆسیی ناسراو بـە "بهاگاڤـاد گیتـا"[1] و لـە ئەزموونـی صـۆفیگەریی ئیـسلامیدا، بـە بۆچـوونی كەسـانێك [2] "رابیعــەی عــەدەوی" بـە یەكـەمین داڕێـژەر و بنیاتنـەری ئـەم قوتابخانەیـە دادەنرێ.

هەڵبــژاردنی ئــەم غەزەلــە بــەو مەبەســتەیە، وێــڕای هاوبۆچوونیم لەگەڵ تێکڕای ئەو لێکۆڵەرەوانەی "مـەحوی" لەژێـر ناونیشانی گەورەی "شاعیرانی کلاسیکی کورد"دا پۆلێن دەکـەن، هەوڵبـدرێت ئـەوە بـسەلمێنرێت کـە "یـەکێتیی بابـەت" - وحـدة الموضوع - بەسەر هەموو غەزەلەکەدا، بە روونـی، زاڵـە. ئەمـەش ناکرێ بـە خاسـیەتی تێکـڕای غەزەلـەکانی شـاعیر دابـنرێ، جگـە لـەوەی بەزانـدنێکی تێڕوانینـە باوەکـەی کلاسـیزمی تێـدا بـەدی دەکـرێ. هەڵبەتــە ســەلماندنی ئــەو "یــەکێتیی بابــەت"ە لــەم غەزەلەدا شاعیر ناباتە دەرەوەی ریزی شاعیرانی کلاسییزم، بەڵام جۆرە تایبەتمەندییەکی غەزەلەکـە دەخاتـەڕوو، لـە هـەردوو رووی شــێوە و ناوەڕۆکــەوە، ئەگەرچــی پێدەچــێ، بــە رواڵــەت، ئــەو تایبەتمەندییە هەر لە رووی شێوەوە بێ.

یەکەمین بـەیت، بـە کـردەوە و لـە هـەموو روویەکـەوە هـەر دەروازەی غەزەلەکەیە. لە هـەر نـۆ بـەیتی غەزەلەکـەدا ئامادەیـی ئەو دەروازەیە بە زەقی بەدی دەکرێت. لـە خـودی ئـەو بەیتـەدا، هــەردوو چوارچــێوەی شــوێن - کــات و هەڵوێــستی بنــەڕەتی و پاساوەکانی ئەوجۆرە هەڵوێست وەرگرتنە بەدی دەکـرێن. وشـەی "دیار" کە کـۆی وشـەی "دار" ی عەرەبییـە و مانـای "خـانوو" و "شـوێنی نیـشتەجێ بـوون" دەبەخـشێ، و بـەو شـێوە کۆیـەی: "دیـار" لـەو بەیتـەدا بـەدی دەکـرێ، جگـە دەربڕیـنی گرنگـی و

گەورەیی شوێنەکە، لە عەرەبیدا پتر بۆ پیشاندانی ناسراوی و پایەداریی خاوەنەکەی بەکار هێنراوە، ئەگەرچی هێندێجار وشەی "دار"یش بۆ ئەو مەبەستە بەکاردەهێنرێ، و تەنانەت جاری وا هەیە هۆبەی خێڵی کۆچەر، بە تایبەت ناودارانیان بۆ مەبەستێکی تایبەتی، هەر وشەی "دار"ی بۆ بەکارهێنراوە، وەکو ئەو چامەیەی "النابغة الذبياني" کە بەم شێوەیە دەست پێ دەکات:

**يا دار مية بالعلياء فالسند أقوت،**

**و طال عليها سالف الأمد**[٣]

لە هەموو حاڵەتێکیشدا، "دار" یان "دیار"، بەو ئاڕاستەیەی لێرەدا مەبەستە، ئەو شوێنەیە کە مرۆڤـ هەموو ژیانی خۆی پێوە گرێ دەدات، و بەمەش چوارچێوەی کات هەموو ماوەی ژیانی، یان بوونی لە حاڵەتی خۆ لە عیشقدا بینین، دەگرێتەوە. ئەم ئامێتەکردنەی کات - شوێن، بەم شێوەیەی لە ڕێگەی چڕکردنەوەی سرووش لە وشەیەکی وەکو "دیار"دا، با شاعیر مەبەستیشی نەبووبێ، بابەتی سەرەکیی غەزەلەکە: "عیشق"ی بە رادەیەك گەورە کردۆتەوە کە هەموو شتەکان - بە خودی شاعیری عاشقیشەوە - لە سایەیدا بچووك و پەراوێزخراون. لە گەوهەریشدا سەرجەمی غەزەلەکە لە خزمەتی

تێگەیشتنی شاعیر بۆ ئەم چەمکەدایە و ئەمە رەنگدانەوەی ئەزموونی صۆفیگەرییە. بە نیسبەت شاعیرێکی پابەندی سلووکی صۆفیگەرییەوە، بە ویستی خۆی بێت یان بەدەر لەو ویستە، ئەو گیانە گشتییە هەر باڵی بەسەردا دەکێشێت و بوون و بەرهەمی دەخاتەژێر کاریگەریی خۆیەوە.

"دەیری عیشق" پێکهاتەیەکی گرنگی دوو پێکهێنەری بناغەییە، کە گەلێك پێش مەحوی، شاعیرانی صۆفی، بە یەکیان ئاشناکردوون، بەلاّم ئەم راستییە ناتوانیّ لە گرنگی ئەو پێکهاتەیە، لەم شوێنەدا، کەم بکاتەوە، بە تایبەت بەو شێوەیە و لە چوارچێوەی ئەو بەیت و غەزەلەدا. شاعیر صۆفییەکی موسڵمانی شافیعییە و "دەیر"یش پەرستگای رەبەنە فەلە "مەسیحی"یەکانە. بەمەش رەنگە ئەم پێکهاتەیە تا رادەیەك، سەیر و نامۆ بێتە پێشچاو، بەلاّم لە گەوهەردا ئەو پێکهێنانەوە ئاشتکردنەوەیە سروشتی بنەڕەتی عیشقە.. ئەو سروشتە رێگە نادات دووبەرەکی و کینە، و تەنانەت خۆپەرستیش سەرهەڵبدات. لە ولاّتی عیشقدا تەنها یەك ئاسمان هەیە.. یەك چەتر هەیە، یان "ئاسمانەکان" و "چەترەکان" و.. تاد، هەر یەك سەرچاوەیان هەیە. ئەمەیان لە رەگە قووڵەکانی صۆفیگەریدا، کە رێبازی عیشق یەکێکە لە پێکهێنەرە بناغەییەکانی، رەنگدانەوەی "یەکتا"یە، و ئەگەر ئێمە قایل ببین بەوەی ئەو بیرۆکەیەی هەموو

بوون و بوونەوەران بە رەنگدانەوەی "یەکتا" دەزانێ پێیبگوترێ "یەکێتیی بوون"، ئەوا دەکرێ ئەم پێکهاتەیە: "دەیری عیشق" بەوە لە قەڵەم بدەین کە لە "یەکێتیی ئایینەکان"ەوە هەڵدەقووڵێ، بەمەش: "دیارم دەیری عیشقە" دەبێتە ئاوڕدانەوەیەکی رەسەنی مرۆڤ لە سروشتی بوونی خۆی و گەڕانەوە بۆ لای سەرچاوەکەی.. ئەو عیشقەش، بێگومان، هەر ئەوەیە کە لە ئەدەبییاتی صۆفیگەریدا ناوی "عیشقی حەقیقی"ی لێنراوە. ئەمە پوختەی هەرە بەرجەستەی شیکردنەوەی پەیوەندییەکانە، بەڵام لێرەدا، لە پەناوە، باس لە دووخاڵی گرنگ کراوە: شاعیر خۆی لەنێو کۆمەڵێکدا بەدی دەکات کە چوارچێوەی جوگرافیی گشتی "دەیری عیشق" کۆیان دەکاتەوە، ئەمەش لە هەرێمی جوگرافیایەکی مەعنەویدایە. هەموو نیشتەجێیانی ئەو هەرێمەش رازێکی گرنگ و تایبەت کۆیان دەکاتەوە کە خودی "عیشق"ەکەیە، و بە رواڵەت ئەو عیشقە لەگەڵ هەموو خەڵکانی دیکەش کۆیان دەکاتەوە، چونکە هەمووان پێیانخۆشە چەترێکی ئاوەها کۆیان بکاتەوە، و هەر ئەمەش هۆی پەسەندیی شیعری صۆفییانەیە لای هەمووان، بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە ئەمە دەرەنجامی ئەزموونێکە کە ئەم جیهانی عیشقە بە تەواوی لە جیهانی عیشقی ئاسایی جیادەکاتەوە، و ئەمەش سەرچاوەی هەردوو ناوی "عیشقی

حەقیقی" و "عیشقی مەجازی"یە.

"جێ بە سووتن بێ لەوێ دەگرم "، بە ڕواڵەت جۆرە سووربوونێکی نائاسایی تێدا بەدی دەکرێت. کە ئەگەر سووتانیش نرخی ئەو خواستە بێت دەبێ هەر بەدی بهێنرێ، بەڵام ئەگەر لە بناغەدا "دەیری عیشق" "دیار"ی کەسێك بێت، واتە: ئەگەر بە کردەوە وڵاتی سروشتی ئەو بێت، چ پێویست دەکات ئەو نرخە گرانەی بۆ بخاتە گرەوەوە؟. کەواتە با بگەڕێینەوە:

**" دیارم دەیری عیشقە، جێ، بە سووتن بێ، لەوێ دەگرم "**

ئەگەر خۆمان ڕابێنین لەسەر لێکدانەوەی "دیارم دەیری عیشقە" بەوەی بە کردەوە ئاوەهایە، ناتوانین خۆمان لە گێژاوی "سەرلەنوێ سەرهەڵدانەوەی ناکۆکیی نێوان ئەو ڕاگەیاندنە و ڕاگەیاندنی سووربوون لەسەر وەدەستهێنانی جێ لەو شوێنەدا" ڕزگار بکەین. کەواتە دەبێ بەدوای دەزوویەکی شاراوەدا بگەڕێین، کە بە بۆچوونی من، لەم لێکدانەوەیەی خوارەوەدا بەدی دەکرێ: "دیارم" واتە ئەو دیارەی بە ڕاستی بە هی خۆمی دەزانم.. ئەوەی تەواوی بوونی خۆمی تێدا بەدی دەکەم.. ئەو تەنها شوێنەی خۆمی تێدا دەدۆزمەوە، یان هەر لێکدانەوەیەکی لەوجۆرە. ئەم ڕێچکەیەی لێکدانەوە بەرەو ئەوەمان دەبات کە خۆمان لە ئاستی ڕاگەیاندنی هەواڵێکی ڕاستەوخۆدا نەبینین، بەڵکو لە ئاستی هەڵوێستێکی پاشەڕۆژبینانەدا. واتە شاعیر دەیەوێ بڵێ: کە من

دەیری عیشق بەو شوێنە بزانم کە بە راستی مانای بوونمی تێدا بەرجەستە دەبێ، دەبێ هەوڵی ئەوە بدەم بیگەمێ و بە کردەوە بیکەمە "دیار – زێد – نیشتمان"ی خۆم، و ئەگەر نرخی ئەوەش سووتان بێت ئەوا دەبێ بیدەم.

بەلاّم ئایا دەکرێ مرۆڤ هەڵوێستێکی دیاریکراوی هەبێت بێ ئەوەی لە ناخەوە پاساوێکی دەروونی بەهێزی بۆ ئەو هەڵوێستە هەبێت؟ بە رواڵەت نەخێر، و بە کردەوەش شاعیر دووەمین بەشی ئەو بەیتەی کردۆتە ئەو پاساوە. پاساوەکەش، بە رواڵەت، روونە: چڵ و چێو بۆ مرۆڤ هیچ کەڵکێکی نییە جگە ئەوەی بیسووتێنێ و خۆی پێ گەرم بکاتەوە، یان بۆ هەر مەبەستێکی دیکەی بەکاربێنێ، بەلاّم شاعیر مرۆڤە و مرۆڤ بۆ ئەوجۆرە مەبەستانە ناسووتێنرێ، خۆی ناسووتێنێ و خۆی بە سووتان نادات. ئەمە گرێیەکە دەبێ وەلاّمبدرێتەوە. لەمەش بەولاوە ئەو لێچواندنەی شاعیر بە "مشتێك چڵ و چێو"، لە لایەن خۆیەوە، ئایا بە راستی بەو مانایەیە کە: "من بە هۆی دەردی دڵدارییەوە ئەوەندە لەڕ و لاواز بووم، بووم بە مشتێك چڵ و چێو و کەڵکی هیچم پێوە نەماوە"؟.[٤]

ئەگەر بە مەنتیقی "کەڵکی هیچم پێوە نەماوە، ئیتر بۆچی بمێنمەوە؟ با لەوێ بۆ خۆم یسووتێم!" بیربکەینەوە رووبەڕووی کێشەیەکی سیستماتیکیی گەورە دەبینەوە. ئەم مەنتیقە گیانی

خۆبەدەستەوەدان (تسلیم) بە دیفاکتۆ (ئـەمری واقیـع) دەنوێـنیٚ، بەو مەعنایـەی ئەگـەر کـەڵکم پێـوە مابـا خـۆم نەدەسـوتاند، یـان لەویٚ نەدەمامەوە بسووتێم"، کەچی مەنتیقی بەیتەکە ئەوەیە کـە "چونکە - دیاری عیشق - بە شوێنی سروشـتی و مانـا بـە بـوون بەخشی خۆم دەزانم، ئەوا هەر لەویٚ جیٚ دەگـرم، هێنـدەش ئـەو" جیٚ گرتن"ەم لا مەبەستە و سوورم لەسەری کە تا سنووری نرخی سووتان (نەك خۆسووتاندن)یش هەر ئامادەم پیٚ دابگـرم. ئـەوەی شاعیر رایگەیاندووە یەکێکە لە نموونە ئێجگار بەرجەستەکانی کارا و کاریگـــەر کردنـــی ویـــست "ارادة"، کەچـــی لێکدانەوەکـــە خۆبەدەسـتەوەدانی بـیٚ دەسـەڵاتانەی بـە شـێوەیەك بەسـەرەوە دیــارە کــە نەهێــشتن و ســڕکردن (تخــدیر)ی ویــست (ارادة)ی بەسەرەوە زاڵە. ئەگەر ئـەو لێکدانەوەیـەی "چـلٚ و چـێو" ئاوەهـا نــاکۆك و ناتــەبا بــوو لەگــەلٚ گیــانی گــشتیی بەیتەکــەدا و ئــەو هاودژییەی هێنایەئاراوە، چ لێکدانەوەیەکی دیکەی لە دەستی ئەو ئاڵۆزییە رزگارمان دەکات؟ هێنـــدەی پەیوەنـــدیی بـــە "چـــلٚ و چێو"بوونەوە هەیە، دەکریٚ دوو رێگەی لێکدانەوە بگرینەبـەر بـیٚ ئەوەی خۆمان دووچاری هیچ جۆرە هاودژییەك بکەین:

١. دەسـتپێکردن لـە "چـلٚ و چـێو"ەو، بـەو پێیـەی بـۆ سـووتان - نـەك خـۆ سـوتاندن - دەسـت دەدات -، و بەمـەش مانایـەك بـە بوونـی دەبەخـشریٚ.. واتـە: لـە بوونـدا ئەرکێکـی

پێسپێردراوە، ئەو ئەرکە دەیکاتە شتێکی مەعنادار و بەکەڵك، نەك بێ کەڵك. بەڵام بۆ ئەوەی بە کەڵك بێت دەبێ لە شوێنی شیاوی خۆیدا دابنرێ.. واتە بۆ سووتان تەرخان بکرێ، دەنا بێ کەڵك دەبێت.

٢. خودی "چڵ و چێو"ەکە، لە رووی رەنگەوە، رەنگێکی ئێجگار نزیکی لە ئاگر هەیە، بەمەش لە رووی شێوەشەوە - نەك تەنها لە رووی ناوەڕۆکەوە - پەیوەندییەکی بەهێز لە نێوان "چڵ و چێو" و "ئاگر"دا هەیە، یان لە نێوان سووتاو و سووتێنەردا هەیە. ئەمەش پەیوەندیی نێوان عیشق (ئاگر - سوتێنەر) و عاشق (چڵ و چێو - سووتاو یان سووتێنراو)ە. هەردوو رووی شێوە و ناوەڕۆکی بە تەواوی پێکەوە گونجاوی پەیوەندیی نێوان عاشق و مەعشووق تایبەتمەندییەکی دیکەشیان هەیە کە لە پەیوەندیی ئاسایی نێوان سووتاو و سووتێنەر جودایان دەکاتەوە. لەم نموونەیەدا سووتاو، نەك هەر لە سووتێنەر بێزار نییە، بەڵکو خۆی بە دوویدا دەگەڕێ و مانای بوونی خۆی لەو سووتانەدا دەبینێتەوە، ئەمەش، بە گوزارشتی دەرونیی شاعیر خۆی لە شوێنێکی دیکەدا، سروشتی بناغەیی عیشقە:

ئەی مەحەببەت، ئاگرێکی هێندە خۆش و دڵنشین
ئەو کەسەی سووتووتە، هەر ئەو هەوڵ ئەدا بۆ سووبەسووت

٩ ت ٤ / ل ٧٩

بەلاَم لە سووتانی ئاساییدا سووتێنەر، ئەگەر کۆتایی بە بوونی سووتاو نەهێنیٚ، ئەوا کاریگەرییەکی ئەوتۆی بەسەر جێدەهێڵیٚ کە شوێنێکی جەستەی لەکار دەخات یان دەیشێوێنیٚ، یان بەلای کەمەوە بیرەوەرییەکی تاڵی ئەوتۆی بۆ دروست دەکات کە بە درێژایی ژیانی لەبیری ناچێتەوە. بەمەش تێکڕای یەکەمین بەیت بەم شێوەیەی خوارەوە لێك دەدرێتەوە:

وڵات و شوێنی راستەقینەی من ئەوەیە کە تەنها یاسای عیشقی تێدا سەروەرە.. ئەو یاسایەی عاشق لە سایەیدا بوونی خۆی لە سووتان و خۆبەختکردن بۆ عیشقەکەی دەبینیٚ، منیش چلیٚ و چێوم.. چ بە شێوە و چ بە ناوەڕۆك هەر ئەوە مەعنا بە بوونم دەبەخشیٚ کە دڵسۆز بم بۆ سروشتی خۆم، کە سووتانە. لێرەوە، بە سووربوونەوە، خیانەت لەو سروشتەی خۆم ناکەم و بە دڵنیاییەوە، بە سووتان، لە شوێنی سروشتیی خۆمدا جیٚ دەگرم.

کێشەی سووتانەکە هێشتا وەکو خۆی ماوەتەوە، ئەگەر بڵێین: "یەکێك دەسووتیٚ" دەبیٚ بزانین بە چ مەعنایەك و بۆچی دەسووتیٚ، و ئایا بەو عیشقە ئاسایی و باوەی نێو خەڵك حاڵەتی راستەقینەی سووتانی هەر کەسێك، بە تایبەت پیاوێك، هەیە باسی لێوە بکریٚ؟. ئایا ئەو عیشقە خۆی ئاگرە یان سروشتی ئاگری هەیە؟ وەلاَمی ئەم پرسیارانە کرۆکی لێکدانەوەی

سیستماتیکیی ئەوجۆرە دەقانەیە کە لە داهێنانیاندا میتۆدێکی تایبەت، بە شێوەیەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، ئامادەیی تەواو و بەهێزی هەیە، و پێویستە ئەو میتۆدە فەرامۆش نەکرێت. لە سەرەتای ئەم خوێندنەوەیەدا ئاماژەکراوە بۆ ئەو راستییەی کە غەزەلەکە لە بواری "عیشقی حەقیقی"دایە، بۆیە میتۆدەکەش هی خودی ئەو بوارەیە.

## گرنگترین ئەو خاڵانەی لەم میتۆدەدا رۆڵی سەرەکی دەبینن بریتین لەوەی:

– ئەو عیشقە دەرەنجامی ئاوڕدانەوەی لوتف - ئامێزی خودی مەعشووقە لە عاشق، بەو مەعنایەی: ئەگەر ئەو لوتفە نەبێ نە عیشق ئاگر لە دڵی عاشق بەردەدات و نە لافی عیشق بنەمای راستەقینەی دەبێت. ئەمەش بەندە بە تەجەللی "دەرکەوتن"ی ناڕاستەوخۆی مەعشووقەوە بۆ عاشق، کە لە گەوهەریدا بڕیارێکی ئەزەلییە و سەرچاوەی بوونیشە. صۆفییان ئەو مەسەلەیە، لە رووی سەرچاوەی بناغەییەوە، بە چەمکی رۆژی پەخشان "یوم الذر" ی قورئانی، کە لە ئەدەبیاتی صۆفیگەریی کوردیدا بە "رۆژی ئەلەست" و "رۆژی ئەزەل" و ناوی دیکەش ناسراوە، دەبەستنەوە، وەکو لەم ئایەتە پیرۆزەدا هاتووە:

**وإذْ أخذَ ربك مِن بني آدم مِن ظُهورِهِم ذُريتهم وأشهدهم علـى أنفُسِهم ألست بِربكُم قَالُوا بلى شهدنا أنْ تقُولُوا يوم الْقِيامةِ إنا كُنا عن هذَا غَافِلِ . / الاعراف ١٧٢ .**

تەجەللی - دەرکەوتن - ەکەش بەم ئایەتە پیرۆزە دەبەستنەوە:

**ولَما جاء موسى لِمِيقَاتِنا وكَلمه ربه قَالَ رب أَرِني أنظُر إِلَيك قَالَ لَن تراِني ولَكِن انظُر إِلى الْجبل فَإِن استقَر مكَانه فَسوف تراِني فَلَما تجلى ربه لِلْجبل جعله دكا وخر موسى صعِقًا فَلَمـا أَفَـاق قَـالَ سبحانك تبت إِلَيك وأَنا أَولُ الْمؤمِنِ / الاعرف ١٤٣ .**

لەم سەروبەندەدا (حافظی شیرازی) دەڵێ:

**در ازل پرتو حسنت ز تجلی دم زد**

**عشق پیدا شد و آتش بهمه عالم زد**

دیوان حافظ غ ١٥٢ / ص ١٧٦

- ئـەم میتـۆدە لـە ئـەزموونی رەوانـیی عاشـقەوە ئـامرازە سیستماتیکییەکانی، بە خودی سیستمە ئەپستمۆلۆژی (مەعریفی) یەکەشـەوە، وەدەسـتدەهێنێت، بۆیـە ئـەزموون (واتـە لایەنـە کردەکی - عەمەلی - یەکە) سەرچـاوەی هـەموو زانیارییەکـە، بـە شێوەیەکی روونتر: رەوشت (ئیتیك - ئەخلاق) بناغە و ژێرخانـە و زانیـاری (مەعریفـە) سـەرخانە. گـەورە صـۆفییان لـەبارەی ئـەم

مەسەلەیەوە زۆریان گوتووە، عەمری کوڕی عوسمانی مەککی لەبارەی چییەتی - ماهیة - ی صۆفیگەرییەوە دەڵێ: "ئەوەیە کە بەندە لە هەر کاتێکیدا بەو شتەوە خەریك بێت کە بۆ ئەو کاتەی لە هەموو شتێکی دیکە گرنگ و پێویست ترە" (٥). ئەبو تالیبی مەککی لە روانگەی لەخودپێچینەوەوە - محاسبة النفس - دەڕوانێتە صۆفیگەری و دەڵێ: "ئەوەیە کە بەندە لە کاتی دەرکەوتنی هیممەت و دەستپێکردنی جموجووڵدا هەڵوەستەیەك بکات و پاشان خولیا - الخاطر -، کە جمەی دڵە، لە شڵەژان، کە رەفتاری جەستەیە، جیا بکاتەوە، و.. ئەگەر دەرکەوت بۆ خوا و لەڕێی وەدەستهێنانی رەزامەندیی ئەوە، لەسەری بەردەوام دەبێت "(٦). کلاباذی /ش دەڵێ: "صۆفییان خەڵکانێکن پشتیان لە دنیا کرد و لە ولآت دەرچوون و لە دۆست و ئاشنای نێو خەڵکەکە دوور کەوتنەوە، و بە ولآتاندا گەڕان و سکیان برسی کرد و لە جلوبەرگی ناپێویست خۆیان بێبەش کرد، و لەم دنیایە هیچ شتێکیان نەبرد جگە ئەوەی عەورەتێك دادەپۆشێ یان برسێتییەك لادەبات" (٧)

- پاش رەزامەندیی بناغەیی مەعشووق، لە ئەزموونی صۆفیکەریدا مەسەلەی بەردەوامی لەسەر بڕینی قۆناغە یەك بە دوای یەکەکانی ئەزموونەکە و سەلماندنی ویستی پێویستی ئەو بەردەوامییە خاڵێکی گرنگە و دەبێ بایەخی گەورەی بدرێتێ.

بەشـێکی بەرچـاوی ئـەم مەسـەلەیە بەنـدە بـە پاراسـتنی رازە گرنگـەکانی بوارەکـە، کـە هـی عیشقەکەشـن، لـە ئـەنجامی ئـەم پاراستنی رازەدا، کە ئەرکێکی ئێجگار سەختیشە، عاشق دەتوانێ لەو جیهانەدا شوێن پێیەك بۆ خۆی بدۆزێتـەوە. دوو سـەری هـەرە بەرجەستەی ئەم لایەنە بریتین لە تـرس (خـوف) و تکـا (رجـاء).. تـرس لـە سـستبوونی ویـست لـە هـەر قۆناغێکـدا و چـۆکدادان و مانـــەوە.. ئـــەو مانەوەیـــەی هـــەموو شـــتێك دەشـــێوێنێ و دەرەنجامەکان، بە تـەواوی بـە پێـچەوانەی مەبەسـت دەگۆڕێـت و ئـاوەژوو دەکاتـــەوە، "مـــەحوی" لـــە شـــوێنێکی دیکـــەدا، زۆر وردەکارانە و بە جوانی ئەمە دەردەبڕێ:

**لە جێ مانەوە ترش و تاڵت دەکات ترێ بوو بە سرکە، عەسەل بوو بە سەم**

– ١٢م٥ / ل ٢٣٦

چونکە لە عورفـی ئـەم ئەزموونـەدا راوەسـتان نییـە، بۆیـە مانــەوە لــە حوکمــی گەڕانەوەدایــە. لــە عیــشقدا، بــە تایبــەت، پیـادەکردنی ویـست بەردەوامییـە لەسـەری تـا گەیـشتنە پلـەی سووتان:

**سەکینەی مەرتەبەی سـووتانیە ئاتەش پەرستی عیشق**
**ئەگەر صاحیب ئیرادەت بێ، عەجەب پیرێکە پەروانـــە**

٤ھ٧ ل ٢٨٧

ترس لەوەش کە سەرتاسەری ئەزموونەکە تاقیکردنەوەیـە، تاقیکدنەوەیەك مرۆڤـ تێیدا، بە تەواوی، نەزانـە لـەوەی چـی دێتـە پێشی، بۆیە ناشزانیٚ دەبیٚ چبکات، ئەم نەزانینە هـەموو شـتێکی لیٚ دەگۆڕێت و رووبەڕووی سەرسامی تەواوی دەکاتەوە:

**بە پیر ئەو ماهەوە چووم و بەسەر چووم پەری بوو، ئەو نـەبوو، شەو بوو، بەسەر چووم**

**تەڵی نێرگســم و باغی حیرەتــم پـــیٚ، بە فـەرٍ هات، و وەکـو گوڵ زوو بەسەر چـــووم** *

٧م ١و٢ ل ٢٢٤-٢٢٥

ئەم سەرسـامییە هێنـدە عاشـق بـیٚ دەسـەلأت دەکـات کـە تــەنها بــە چـرای نیازپـاکی دەتوانـیٚ رێگـەی خـۆی بدۆزێتــەوە.. لێرەشەوە بایەخی گەورەی " دڵ "، کە نیـشتمانی هـەر نیازێکـە، دێتە ئاراوە، ئەو دڵەی هێندە خۆبەدەست مەعـشووقەوە دەدات و پشتی پیٚ دەبەستیٚ کە خاوەنەکەی بە تەواوی فەرامۆش دەکات:

**دڵ لە ســـــــــینەم هیجرەتی کرد و وتی:**

**بوونە، عومریٚ، فەرشی ئاتەشـــــخانە، بۆچ ؟**

١چ ٣ ل ٩٥

ئـــەو دەســـەڵاتەی یـــار هەیـــەتی و دڵـــی عاشـــقانی پـــێ داگیردەکات دەسەڵاتێکی هەمەلایەنە و گشتگیرە:

**کەی دڵ دەسێنرێ لە بتێ، سەندبێتی ئەو**

**لێوی لە میسر و زوڵفی لە چینی خەراج و باج**

١ج ٥ ل ٩٣

ئەو سەرسامییەی پێش چەند دێڕێك ئامـاژەی بـۆ کـرا، کـە دەشــبێتە مایــەی بــێ دەســەڵاتیی مرۆڤــ، مــەرج نییــە تەنهــا سەرچاوەکەی نەزانین بێ. هەرجۆرە ستەمێك مرۆڤـ لە خۆی بکات بەرەو ئەو ئاقارەی دەبات. ئەو ستەمە سەرەتای هەنگاونانە - بە دارشتنی تایبەتی صـۆفییان - بـەرەو دامـاڵینی ئـەو ڕووناکییـەی جەوهەری مرۆڤە، و داپۆشینی "ئاوێنـەی دڵ" بـەو "لەکـە"یـەی، ئەگــەر وریــای نــەبین پەرەدەســتێنێ و هــەموو دڵ دەگرێتــەوە، ئەمەش لە ڕۆحی فەرموودەیەکی پێغەمبەر (ص) ەوە وەرگـیراوە: (ئەگــەر بەنــدە گونــاهێکی کــرد خــاڵێکی رەش بەســەر دڵییــەوە دروســت دەبــێ، ئەگــەر پاشــگەز ببێتــەوە و تۆبــە بکــات بێگــەرد دەبێتەوە و ئەگەر بۆی بگەڕێتەوە خاڵـەکان زیـاتر دەبـن تـا دڵـی دادەپۆشن)[٨] ، خودی ئەو فەرموودەیەش ئاماژە بـۆ ئـەم ئایەتـە پیرۆزە دەکات: **كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَا كَـانُوا يَكْـسِبُونَ / المطففين ١٤** ، و بەمەش ئەو جەوهــەرەی خـۆی لـە دەسـتدەدات

کە بۆی دروستکراوە، و ئەگەر ئاوڕدانەوەی جیددیی نەبێ بۆ ئەو حاڵەی خۆی ئەوا دڵ دەرگای تێگەیشتن و دەرککردنی بە روودا دادەخرێ: **ومن أظلم ممن ذكر بآيات ربه فأعرض عنها ونسي ما قدمت يداه إنا جعلنا على قلوبهم أكنة أن يفقهوه وفي آذانهم وقرا وإن تدعهم إلى الهدى فلن يهتدوا إذا أبدا / الكهف ٥٧** ، ئەو جەوهەرەی دڵ دەکاتە سەرچاوەی زانست، بەو مەرجەی بە رووناکیی عیشق ئاوەدان بێ، مەحوی دەڵێ:

**دڵ لە ئیدراکی حەقیقەت بێ بەشە بێ داغی عیشق**
**"مەحویا" دانا دەبێ بەم چاوە بینایی بکا**
**٦أ ٩ ل ١٩**

ئەم ئەزموونی صۆفیگەرییە، لە ئاساییترین حاڵەتیدا، کە مرۆڤ لەلایەن مەعشووقەوە بۆ ئەزموونەکە هەڵبژێردرا، و سەرەڕای ئەوەش لە هەستیارترین جمگیدا لە ئاستی سەختیی ئەرکەکەیدا نەبوو، مەعشووق ئەو ئەزموونەی هێندە لێ سەخت دەکات کە لە هەموو دەوروبەر و پەناگەیەکی دادەبڕێت، و تاك و تەنیا، رووبەڕووی خۆیەتی و چارەنووسی خۆی دەکاتەوە، ئەمەشیان هەر لە رووی لوتفەوەیە. صۆفییەکان، لە نێو قورئانی پیرۆزدا چەندین نموونەیان لە بەردەستدایە. ئەوەتا حەزرەتی یونس (د.خ)، کە پشت لە ئەرکی سەرشانی دەکات، رووبەڕووی

ئـــەو چارەنووســـی تـــاریکی و تەنیاییـــەی نێـــو ســـکی نەهەنـــگ دەکرێتـەوە: **وذَا النون إذْ ذَهب مغاضِبا فَظَن أنْ لَن نقْدِر علَيـهِ فَنادى فِي الظلُماتِ أنْ لا إله إلا أنت سبحانك إنـي كُنـت مِـن الظالِمِ / الانبياء ٨٧**

لـه ژیـانی یـارانی پێغەمبەریـشدا (ص) ، دواکـەوتنی سـێ کەس لە یاران، بەبێ پاساوی گونجاو، لە جیهاد، کە بریـتی بـوون لە کەعبی کـوڕی مالیـك لـە تـیرەی بـەنی سـەلمە و هیـلالی کـوڕی ئومەییە لە تیرەی بەنی واقیف و مەرارەی کوڕی رەبیع لە تـیرەی عەمرو بن عـەوف، بـووە مایـەی ئـەوەی رووبـەڕووی چارەنووسـی ترسناکی ئۆقرە لێهەڵگرتن ببنەوە تا ئەو رادەیـەی زەوییـان، بـەو هەموو بەرینییە، لێ تـەنگ ببێـت: **وعلَى الثلاثَةِ الذِين خلفُوا حتى إذَا ضاقَت علَيهم الأَرض بِما رحبت وضاقَت علَيهم أنفُسهم وظَنوا أنْ لا ملْجأ مِن اللهِ إلا إلَيهِ ثُم تاب علَيهم لِيتوبوا إن الله هو التواب الـرحِيم / التوبـة ١١٨** [9]، وەکـو سـەرنج دەدرێ، ئـەم تاقیکردنەوە سـەختە، کـە لـە چوارچـێوەی زاراوە قورئانییەکانـدا وشەی "فتنة" [10] شی بـۆ بـەکاردەهێنرێ، هەمیـشە بـە نیـسبەت ئەوانەوە کە بە "دڵ"ێکی خاوێنەوە: "إنّما الأعمالُ بالنيّات و انّمـا لكُلِّ امرئٍ ما نوى"[11]، روو لە عیـشقەکەیان دەکـەن و ئەرکەکانـی بەجێدەهێنن، لوتفێك لە ئارادایە. ئەو لوتفە لەوەدایە کـە هەڵـەکار بـواری بەخۆداچـوونەوەی دەدرێـتێ، و بەمـەش پـتر رێوشـوێنی

ئەرکەکانی دەدۆزێتەوە.. واتە گومڕا ناکرێ: **واختار موسى قومه سبعِ رجلاً لِميقاتِنا فلما أخذتهم الرجفةُ قال رب لو شِئْت أهلكْتهم مِن قبلُ وإياي أتهلِكُنا بِما فَعلَ السفهاءُ مِنا إنْ هِي إلا فِتنتك تضِل بِها من تشاءُ وتهدِي من تشاءُ أنت ولينا فاغْفِر لنا وارحمنا وأنت خير الْغافِرين / الاعراف / ١٥٥** لێرەوەیە کە تەنها پەنای عاشق هەر خودی مەعشووقە، و ئەو پێویستی "فقر"ە گەورەیەی عاشق بۆ مەعشووق، لە هەمانکات و شوێندا، بێ نیازی "استغناء"ێتی لە هەر کەس و شتێك لە دەرەوەی مەعشووق و عیشقەکەی:

**تۆ نەبی مەلجەئی من بی (ابدا) نیمە مەلاذ لەو دەرە بێتو دەرم کەی، بە خودا نیمە مەلاذ**
**شوکری حەق بەردەری هەر فەقرە ئیقامەتگاهم بەر دەروباری نە سوڵتان ونە شا نیمە مەلاذ**

١ ذ ١ ل ١١٦ و ١١٧

ئەمە جەوهەری مەسەلەکە و ئەو رازەیە کە، ئەگەر بە سووتانیش بێت، یان بە هەر نرخێکی دیکە کە بەلای خەڵکانی ئاساییەوە زۆر قورسە، عاشق تەنها لە دەیری عیشقدا شوێنی خۆی دەبینێ، و ئەوەی لەوێدا بەدیی دەکات، لە هەر شتێکی دیکە بەلایەوە خۆشترە:

**خەلاصیی بوونی قەت ناوێ ئەسیری زوڵفی زنجیرت**
**لەبەر تیرت، مەلەك بێ، هەڵفڕینی نەبووە نەخچیرت**
٤ ت ١ ل ٦٦

بەلاّم ئایا شاعیر لەو "دەیری عیشق"ەدا جێگیر بووە؟

وەلاّمی ئەم پرسیارە لە روانگەی خودی ئەزموونەکەوە، نەك تەنها بەم غەزەلە بەڵکو بە هەموو دیوانەکەش ئاسان نییە، ئەرکی ئەم خوێندنەوەیە تەنها بەکارهێنانی هێڵە سەرەکییەکانی میتۆدی لێکۆڵینەوەی صۆفیگەرانەیە بۆ لێکدانەوەی دەق، نەك حوکمدان بەسەر خودی ئەزموونەکە، بۆیە ئەو یەکەمین بەیتە دەکرێتە دەسپێك و سەرەتاگە، بەو مەبەستەی سەرجەمی غەزەلەکە بکرێتە نیشانەیەك بۆ کۆششی ئەنجامگیریکردن، ئەمەش تەنها لە رێگەی دیاریکردن و چاودێریی رەوتی گەشەی واتا -مەعنا-، لە روانگەی میتۆدی ئاماژە بۆ کراوەوە، و هەڵبژاردنی ئەو ئامارژەیەی لەگەڵ ئاراستە گشتییەکەدا دەگونجێ.

لە دووەمین بەیتدا، بە رواڵەت، ئاراستەکە دەگۆردرێت: لە عیشقەوە بۆ خودی مەعشووق "**نەگەییە دامەنی دەستی دوعا**"، بەلاّم ئایا مەعشووق "دڵ لێچوو" سەرچاوەی عیشقەکەش نییە؟ واتە: ئایا بە کردەوە ئاڕاستەکە گۆڕاوە؟ ئەمە لە لایەکەوە.. لە لایەکی دیکەشەوە گرنگە لە ئاستی لێکدانەوەی بەیتەکەدا، بە گشتی هەڵوەستە بکەین، و لە لێکدانەوەی

وشەکانەوە دەست پێ بکەین، بە تایبەت ئەوانەی لە پێکهێنانی تێکڕای بەیتەکەدا شوێنی تایبەتیان هەیە، بەو رادەیەی دەکرێ بە "بەردی گۆشە"[١٢]ی ئەو بونیادەی لە قەڵەم بدەین. لە سەروو، و پێش هەموو وشەیەکی دیکەش پێویستە وشەی "**دامەن**" بخرێتەژێر رۆشناییەوە.. ئایا دەگونجێ بە مەعنای "داوێن" لەم بەیتەدا بەکار هێنرا بێ؟، و ئەگەر ئەو مەعنایە ببەخشێ، ئایا گرێ و گۆڵی ئێجگار گەورە و بەرچاومان بۆ دروست ناکات؟

وشەی دامەن "دامن"ی فارسی، لە بناغەدا مەعنای چمك و بەشی خوارەوەی شت دەبەخشێ، بە پێچەوانەی "بالا - بالاٌ" کە بەشی سەرەوەی شتە. لە زمانی کوردی و لە شوێنە جیاجیاکاندا چەندین وشەی وەکو "دامان"، "داوان"، "دامێن" و "داوێن"یش بەکاردەهێنرێن، کە ئەمەی دواییان مەعنایەکی زاراوەیی تایبەتی بەخۆوە گرتووە، و مامۆستایانی لێکدەرەوەی "دیوانی مەحوی"ش هەر بەو مەعنایە بەکاریانهێناوە. وشەی دوعا "**دعاء**"ی عەرەبیش روونە کە مەعنای "تکا"، "نزا" و "پاڕانەوە" دەبەخشێ. لێکدانەوەی مامۆستایان بۆ "**نەگەییە دامەنی دەستی دوعا**" بەم شێوەیەیە: "**هەرچەندم کرد** (لە گۆشەگیریدا) دەستی پاڕانەوەم نەگەیشتە داوێنی یار".

پێش ئەوەی پێکهاتەی لێکدانەوەکەی مامۆستایان شیبکەینەوە، بە مەبەستی داوەریکردنی مەنتیقییانە، بە

پێویستی دەزانم ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە سووکە کێشەیەکی خاڵبەندیشمان لێرەدا هەیە. بەپێی ئەو خاڵبەندییەی لە دیوانەکەدا بەدی دەکرێت، کە هیچ کۆمایەك لە نێوان هەر چوار وشەی پێکهێنەری رستەکەدا نییە، بە کردەوە ناتوانرێ باس لە بوونی "رستە" بکرێ، چونکە "دامەن" دراوەتە پاڵ "دەست" و ئەویش دراوەتە پاڵ "دوعا"، و بەمەش "بکەر - فاعل" نەناسراو دەبێ، واتە "شتێك؟ نەگەیشتە دامەنی دەستی دوعا"، لێرەشدا، جگە ئەوەی تووشی گێژاوی چییەتی "ماهیة"ی ئەو "شت؟"ە دەبین ، بە ئاسانیش ناتوانین لە گێژاوی مەبەست لە: "دامەنی دەستی دوعا" خۆمان رزگار بکەین، بەڵام مەبەستی مامۆستایان ئەوە نییە کە "بکەر" ئاوەها بە نەناسراوی بمێنێتەوە، چونکە لە لێکدانەوەکەدا روونە کە "دەستی دوعا - دەستی پاڕانەوە" بە بکەر دانراوە، بەڵام بەپێی خودی ئەو لێکدانەوەیەش دەبوو ئەو رستەیە بەم شێوەیە بنووسرایە: "**نەگەییە دامەنی، دەستی دوعا**،". ئاشکراشە کە بە هۆی پێویستیی شیعرییەوە، بکەر لە سەرەتای رستەوە بۆ کۆتایی گوێزراوەتەوە.

بە گەڕانەوە بۆ لێکدانەوەکە.. بەرز کردنەوەی "دەستی پاڕانەوە"، لە کوردەواریدا، هەر بەو دەربڕینەش باوە: "**دەستی پاڕانەوە**"، و لە کرۆکی مەسەلەکەشدا، ئەمە گواستنەوەی

دەقــاودەقی نیازمەنــدبوونی بەنــدە - **حاجــة العبــد** - و نیــاز بەجێهێنــەر - **قاضــي الحاجـات** - بوونــی خودایــە. ئــەوەی ئــەو کێــشەیەی لێــرەدا هێناوەتــە ئــاراوە وشــەی "**داوێــن**"ە. لــەم رستەیەی لێکدانەوەکەدا: "**دەستی پاڕانــەوەم نەگەیشتە داوێنــی یار**" ، ئایا دەتوانرێ پەی بە مەعنایەکی روونــی بــێ گــرێ و گــۆڵ ببرێت؟.. واتە: ئایا "**دەستێکی پاڕانــەوە**" هەیــە بگاتــە "**داوێنــی یار**"ێك، و بۆچی بیگاتێ؟ خودی وشەی "**داوێن**" چ دەگەیەنێ؟ هێندەی من ئاگام لێ بووبــێ وشــەی "**داوێــن**" زۆر کــەم بــە مەعنــا زمانەوانییەکەی لــە دەقــی داهێنەرانــەی کوردیــدا بــەکار هێــنراوە، یــەکێکیش لــەو دەقــە داهێنەرانــە کەمــە ئــەم نموونەیــەی لای "**گۆران**"ە:

**بڵێ بەو بووکی تازەی یەك شەوەم گەر هاتە سەر نەعشــم،**
**نەڵێ خۆی بۆ وەتەن کوشت و لە ڕێی عەشقی منا نەژیــا**
**وەظیفەم بوو لە پێناوی ولاتێکــدا ســـەرم بەخشـــم:**
**کە تۆی پەروەردە کرد بۆ من لە داوێنی چیــا و کــەژیــا**[١٣]

کــە بــە مــەعنای "بەشــی خــوارەوە"، بنــار و دامێــنی چــیا هاتووە، لەو چەند نموونە کەمە بــەولاوە، لــە ئــەدەبییات و زمانــی گفتوگــۆی رۆژانــەی کوردیــشدا، بــۆ هیــچ مەعنایــەکی دیکــە بەکارنەهێنراوە جگە ئاماژەکردن بۆ شــوێنێکی تایبــەتی مرۆڤــ، چ

نێرینە بێت و چ مێینە. هێندەش کورد ئەو شوێنەی بە هەستیار زانیوە کە بەشێکی ئێجگار بەرجەستە و گرنگی رەوشتی مرۆڤ بە "داوێن"ەوە گرێدراوە. کە دەگوترێ: "فلاّنە کەس داوێنپاکە یان داوێنپیس" مەبەستەکە ئەوەیە کە داوێنی بە شێوەیەکی رەوا یان ناڕەوا، بە پێی نەریتی کوردەواریی پشت ئەستوور بە ئایین، بەکاردێنێ. ئەم چڕکردنەوەیەش لەخۆڕا نەهاتووە، و تەنها لەنێو فەرهەنگی زماندا بەدی ناکرێ، بەڵکو لە پۆشاك و رەفتاری کۆمەلاّیەتی و هەموو لایەنێکی پەیوەندیداری دیکەی هەڵقوولاّو لەو نەریتەوە بەدی دەکرێ.

لە بەرانبەر بەکارهێنانی وشەی "داوێن" پتر بەو مەعنایەی روونکرایەوە، وشەکانی "دامان" و "داوان" و "دامێن"یش پتر هەر بە مەعنا زمانەوانییەکەی خۆی، واتە: "بەشی خوارەوەی شت" بەکاردەهێنرێن، ئەگەرچی بە مەعنای "ئامێز - باوەش"یش بەکاردەهێنرێن، بەلاّم بێ ئەوەی ئاماژە سێکسییەکەیان تێدا مەبەست بێت.

ئەوەی لە لێکدانەوە ئاماژە بۆ کراوەکەی مامۆستایاندا بەدی دەکرێ بەکارهێنانی وشەی "داوێن"ە بە مەعنا زمانەوانییەکەی، ئاشکراشە ئەو شێوە بەکارهێنانە زیانێکی گەورە دەگەیەنێتە بەهای شیعریی ئەو بەیتە و هەموو غەزەلەکە، و بە تەواوی لە ئاڕاستەی گشتیی غەزەلەکە دووری دەخاتەوە، لەمەش

بەولاوە گریٚ - کوێرەیەکی سەیر دەخاتە بەردەم هێڵی گشتیی دەقەکە، و رووبەڕووی جۆرە تێکەڵکردنێکی نەگونجاوی چەمکێکی مەعنەویی لە مادده داماڵراوی وەکو "دوعا - نزا - پاڕانەوە"، کە بە تەواوی لایەنی رەوانی -رۆحی- ی بەسەرەوە زاڵە، و چەمکێکی سنوور بۆ کێشراوی فیزیکیی وەکو "داوێن" — کە بە تەواوی ئیحای ئارەزووخوازی دەبەخشیٚ - دەبینەوە. ئەوەی پتر ئەو لایەنی ئارەزووخوازییەی چڕتر کردۆتەوە ئەو ئیحایەیە کە "دەست" بگاتە "داوێن"ی یار، ئەگەرچی دەستی پاڕانەوەش بێت، وەکو لە لێکدانەوەکەدا هاتووە. بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی بابەتییانەتر ئەو لێکدانەوەیە هەڵبسەنگێنین، پێویستە هەڵوەستەیەك لە ئاستی وشەی "دەست"یشدا بکەین.

بەدەر لە مەعنا ئاساییەکەی، کورد وشەی "دەست"ی بە مەعنای "دەسەڵات" و "پشکی بەشداری" و "کاریگەری"ش بەکارهێناوە، هەڵبەتە لە کاتێکدا کە ئەو وشەیە بە تەنیا - وەکو وشەیەکی سادە - بەکار بێت، نەك بە شێوەی بەشێکی وشەیەکی لێکدراوی وەکو "دەستسپی"، بە مەعنای ئەوەی لێوەشاوەیی و شارەزایی لەکاردا نییە، یان "دەستزبر"، بە مەعنای ئەوەی لەنێو کاردا هێندە قاڵبۆتەوە کە پێوەی دیارە، یان بە مەعنای ماندوو و زەحمەتکێش، و "دەستبەسەر" و "ژێردەستە" بە مەعنای دیل و ئەوەی لە ژێر فەرمانی کەسی دیکەدایە، و "دەستەمۆ" و

"بەیدەست"یش بە مەعنای راهاتوو و رامکراو -ماڵی کراو -، مەحوی دەڵێ:

**چاوەکەی بەیدەستی مەستیشە، کەچی هەر بە لەحظێ**
**فیتنەیێ بەرپا دەکا**

٨ أ ٦ ل ٢٤

واتە، لە کاتێکدا ئەو وشەیە بەشدار نەبێت لە پێکهێنانی ئیدیۆمێك یان وشەیەکی لێکدراو، تەنها وەکو کینایە بۆ "دەسەلات" و "کاریگەری" و "پشکی بەشداری" بەکاردەهێنرێ، نموونەی ئەمەش زۆرە، مەحوی خۆی دەڵێ:

**غەنیمەتە، بە دەم و دەستی بگرە دامەنی دۆست لە دەستی خۆتی مەدە، داویە خودا تا دەست**
**هیلاکی دەستی حەناییتە، کوشتە بێ دەمی تێغ ئەمن شکاریی پابەستە و، و ئەتۆ با دەست**

٥ ت ٤و٧ ل ٧٠و٧١

کە لە یەکەمین بەشی یەکەمین بەیتدا وشەی "دەست" بە مەعنای ئاسایی بەکارهێنراوە، بەلام لە دووەمین بەشدا جارێك وەکو ئیدیۆم بە مەعنای "لە کیسدان - لە دەستدان" و جارێکیش وەکو کینایە بۆ دەسەلات بەکارهێنراوە، لە یەکەمین بەشی دووەمین بەیتیشدا هەر بە مەعنا ئاساییەکەی و دووەمین

بەشیدا وەکو کینایە بۆ هێز و دەسەڵات بەکارهێنراوە.

ئەو شێوە بەکارهێنانەی وشەی دەست لە لێکدانەوەکەدا ئیدیۆم نییە، کەواتە یان دەبێ بە مەعنا زمانەوانییە ئاساییەکەی بەکارهێنرابێ، یان وەکو کینایەك بۆ "دەسەڵات" و "کاریگەری"، لەم حاڵەتەدا دەبێ لێکدانەوەکە بەم مەعنایە بێت: "دەسەڵاتی پاڕانەوەم" یان "کاریگەریی پاڕانەوەم" نەگەییە داوێنی یار"، ئەمە چ مەعنایەك دەبەخشێ؟

رەنگە بگوترێ "دەست" لەو لێکدانەوەیەدا وەکو ئیدیۆم بەکارهێنراوە و "دەستم نەگەییە داوێنی یار" شێوە دەربڕینێکی دیکەی "دەست بە دامێنی یار نەبووم"ە، واتە: "یار گوێی لە پاڕانەوەم نەگرت" کە پێمگووت: "دەخیلتم"، و هەردوو وشەی "داوێن" و "دامێن" هەمان مەعنایان هەیە. ئەگەرچی ئەمجۆرە مەعناکردنەی ئەو رستەیە گونجاوە و مەنتیقی خۆی هەیە، بەڵام ئەو جۆرە "پاڕانەوە"یەی لێرەدا بەدی دەکرێت تکا بە - رجاء، - نەك "دوعا - دعاء". جیاوازیی ئەم دوو چەمکەش زۆر روون و گەورەیە.

دەرەنجامی ئەو کێشەیەی لێکدانەوەی مامۆستایان دروستی دەکات، هاوبۆچوونیی خۆم لەگەڵ مامۆستایان لەو خاڵەدا دووردەبڕم کە لە لێکدانەوەی ئەو بەیتەدا دەبێ پەی بەو راستییە ببەین کە شاعیر نایەوێ هەواڵێکمان پێرابگەیەنێ و بڵێ:

"خەڵکینە دەستم نەگەییە دامەنی یار"، چونکە ئەگەر وا بێ وشەی "جا " لە "جا دەبمە خاکی رێی"دا هیچ شوێنێکی نابێ، بەڵام پێموایە دانانی "هەرچەندم کرد" لەو شوێنەدا هێندە سەرکەوتوو نییە، چونکە لە لایەکەوە پەیوەندیی ئەم بەیتە بە بەیتی پێشووەوە زۆر لاواز دەکات و سەرجەمی ئەم بەیتە دەکاتە دەرەنجامی کۆششەکە، کە هێشتا زۆر زووە و کاتی ئەوە نەهاتووە. لە لایەکی دیکەشەوە شوێنی "جا" هێندە پایەدار نابێ. لێکدانەوەی گونجاو ئەوەیە شاعیر بڵێ: "ئەگەر، یان لە کاتێکدا کە، دەستی دوعام نەگەییە دامەنی یار.. واتە بڕی نەکرد تا ئەو سنوورەی کاریگەریی هەبێ "یان" ئەگەر دوعام نەگەییە دامەنی دەستی یار" جا ئەوکاتە (ئینجا - ئەنجا) دەبمە خاکی رێی، بەڵام ئەمە تەنها تەواوکردنی مانای رستەیەکە بە رێکخستنی وشەکانی بە شێوەیەکی دیکە و ناتوانێ مەبەستەکەی، بەو شێوەیەی شیاو و پێویستە، روون بکاتەوە.

بەپێی ئەم لێکدانەوەیەی دوایی وشەی "دامەن" هەر مەعنای "بەشی خوارەوە" و "پەراوێزی شت" دەبەخشێ، وشەی "دەست"یش مەعنای "کاریگەری" یان "دەسەڵات" دەبەخشێ. ئەگەر ئەو رستەیە بەم شێوەیە بخوێنینەوە: "**نەگەییە دامەنی، دەستی دوعا**" ئەوا لێکدانەوەکە بەم شێوەیە دەبێ: "ئەگەر، بە سووتانیش، سەرنەکەوتم لەو کۆششەی کە لە

"دەیری عیشق"دا جێیەك بگرم، و ئەگەر دوعا و نزام، کاریگەریی ئەو دوعایەم، تەنانەت نەگەیشتە نزمترین بەشی یار، واتە ئەگەر کەمترین کاریگەریی بەسەر یارەوە دەرنەکەوت، کە لە شێوەی لوتف و پەسەندکردنی عیشقەکەی عاشقدا دەردەکەوێ، ئەوا هەر هێندەم بۆ دەمێنێتەوە ببمە خاکی رێی.. واتە ئەو بە خۆڵەمێش بوونەم، لە ئەنجامی سووتاندا، هێندەی بە دواوە بێ کە خۆڵەمێشەکەم لەسەر رێی یاردا رۆ بکرێت و ئەو شەرەفەم بەربکەوێ کە ببمە خاکی بەر پێی.

ئەگەر رستەکە بەم شێوەیە بخوێنینەوە: "**نەگەییە دامەنی دەستی، دوعا**"، واتە: ئەگەر "دوعا - پاڕانەوە" بە تەنێ بکەر - فاعل - بوو، ئەوا لێکدانەوەکە بەم شێوەیە دەبێ: ئەگەر، یان لەو کاتەدا کە، پاڕانەوەم لای یار هێندە فەرامۆشکرا کە نەگەیشتە نزمترین خالی دەستی "کاریگەریی - دەسەلاتی"، کە لە رێگەی گیرانەبوونی ئەو دوعایەوە دەردەکەوێ، ئینجا ناچار دەبم ببمە خاکی رێی.

"**جا دەبمە خاکی رێی**" دارشتنێکە ناکرێ ئاوەها بە سانایی بە سەریدا پێپەڕین، چونکە ئەو "جا"یە، کە مەعنای "ئینجا - ئەو کاتە" دەبەخشێ، "**بوون بە خاکی رێ**"یەکە دەکاتە ئەنجام... واتە پێشکاتی - الاسبقية الزمنية - بۆ "دوعا - پاڕانەوە"کە دەبێت و پاشکاتی بۆ "بوون بە خاکی رێ" یەکە.

ئەگەر ئەمەش بەوە لێکبدەینەوە کە مرۆڤ، بە سووتانی، دەبێتە خۆڵەمێش، و ئەو خۆڵەمیشە دەتوانێ ببێتە "خاکی رێ"، ئەوا دەبێ بڵێین شاعیر جێگۆڕکێیەکی لە رووی پێشکاتییەوە لە یەکەمین و دووەمین بەیتی ئەم غەزەلەدا هێناوەتە گۆڕێ. ئایا ئەمە لەخۆڕا و بە شێوەیەکی نابەجێ کراوە، یان پاساوی تایبەت و بنەمای خۆی هەیە؟

بە گەڕانەوە بۆ ئەزموونی صۆفییانە، ئەوەی لەو ئەزموونەدا.. لە چوارچێوەی مەنتیق و پرنسیپە بنەڕەتییەکانی رێبازی عیشقدا بەدی دەکرێ ئەوەیە کە عاشق، تەنها بەوەی نیازی چوونەریزی سالیکان -رێگرتووان - ی رێبازەکەی هەبێ، دەبێ ئەو راستییەی لە پێشچاو بێت کە ئەم ئەزموونە هەرگیز بە دوانەیی - ثنائیة - ی "عاشق - دڵدار" و "مەعشووق - دڵ لێچوو" قایل نابێت، و توانەوەی عاشق لە "عیشق"دا - کە بەرانبەر بە سووتان، فەوتان، توانەوە - فەنا - و چەند ناونیشانێکی دیکەش دادەنرێ - ئەو مەنتیقەیە کە عاشق، لە سەرەتاوە، دەبێ بە راستیی هەرە دیار و بەرجەستەی "رێباز"[١٤] ەکەی بزانێ و کاری بۆ بکات، مەحوی دەڵێ:

**تا نەبووری تۆ لە سەر، رێ ناخەیە مەیدانی عیشق**
**سەر، لە پێشی پێ، دەبێ لەم رێگە دانێی (اولا)**

١٠ أ ٥ ل ٢٩

لایەنی دیکەی ئەم ئەزموونەش ئەوەیە کە ئەم فەوتان و توانەوەیە بریتییە لەوەی عاشق لە بوونێکی کرچ و کاڵ و ناپایەدارەوە، بەو فەوتان - فەنا - یە، بەرەو "ئاوەدانیی بوون - عیمرانی بەقا" و مانەوەی راستەقینە ***من لە یەکدا یەك دەبینم، چل لە دوودا، دە لە سێ*** ***<u>مەنهەجی عیشقی حەقیقی</u>*** ***(نوون) ە، پەنجای جێ بە جێ***

دیوان، بەسەردا هاتنەوە، ل ٥٤٦

له بەیتی (١٠ أ ٥ ل ٢٩) شدا، "مەحوی" وشەی - رێگەی بۆ "رێباز" بەکارهێناوە. هەنگاو دەنێ، کە بوون و مانەوەیە بە مەعشووق:

**بەڵکە لەم رێیەوە من پەی بەمە <u>عیمرانی بەقا</u> " مەحویا " غەیری خەراباتی <u>فەنا</u> نیمە مەلاذ**

١ ذ ٧ ل ١١٧

بەم پێیەش، لەم غەزەلەدا "مەحوی" مەنتیقی ئەزموونەکەی زاڵ کردووە بەسەر "کات"دا، واتە پێشمەنتیقی "الاسبقية المنطقية"ی رەچاوکردووە، نەك "پێشکاتی"، و ئەمەش زیاتر لەگەڵ جەوهەری ئەزموونەکەدا دەگونجێ، کە خۆی لە پێوەر و پێوەندەکانی جیهانی فیزیکی ("شوێن - کات" و هەموو رەهەندەکانی ئەو جیهانە و چەمك و یاساکانی) رزگار بکات، و لە هەموو روویەکەوە، نوقمی بێ پایانیی جیهانی عیشق

بێت.. ئەو جیهانەی کە عیشق تەنها راستیی رەهاکراوێتی و هەر هەموو بوون رەنگدانەوەی ئەو مەعشووقەیە کە بە عیشق رەنگڕێژیی کردووە، و چەمکەکانی ئاوەها بە ئاسانی باس ناکرێن:

**باسی چبکەم، بێکەرانیی بەحری پڕ تەشویری عیشق!؟**
**تاقە قەطرێکی (فوتووحات) ە، نمێکە (مەثنە وی)**

١٢ ی ٧ ل ٣١٨

هەر ئەوەش کە مەعشووق تەنها راستیی باڵای بوونە و هەموو بوونەوەران، بە گشتی، رەنگدانەوەی ویستی ئەزەلیی ئەون، وا دەکات بوون هەر یەك بێت:

**غەیری وەحدەت لە وجوودا نیە، کەثرەت وەهمە سادە تەکراری یەکە مەنشەئی ئەوهامی عەدەد**

٢د٦ ل ١١٣

خاڵێکی دیکەش هەیە ناکرێ فەرامۆش بکرێ کە راستەوخۆ پەیوەندیی بە پاڕانەوە "دوعا"وە هەیە لە روانگەی چوونەنێو ئەزموونی صۆفیگەرییەوە، و وێڕای بایەخدانی تایبەتی گەورە صۆفییان بەو خاڵەی کە پاڕانەوە هەمیشە شادەماری پەیوەندیی راستەوخۆی نێوان عاشق و مەعشووقە، بەڵام لە هیچ سەرچاوەیەکی بناغەیی ئەم بوارەدا دەقێکم بەرچاو نەکەوتووە باس لەوە بکات کە پاڕانەوە "دوعا" ببێتە مایەی چوونەنێو

ئەزموونەکەوە، یان سەرکەوتن لەو کۆششەدا، ئەگەرچی بەپێی دەقی چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆز و فەرموودەش پاڕانەوە کارایی خۆی هەیە، لەوانە: **وإذَا سألكَ عِبادِي عَنّي فَإنّي قَريـب أجيب دعوةَ الدّاعِ إذَا دعانِ فَلْيستجيبوا لِي وليُؤمِنوا بِـي لَعَلَّهـم يرشدونَ / البقرة ١٨٦ .** بەڵام بەگشتی، پێویستە باس لەوە بکرێت کە گەورە صۆفییان ئاوڕیان لەم مەسەلەیە داوەتەوە و بایەخیان زۆر پێداوە، و تەنانەت، بە پەیرەویکردن لە فەرموودەیەکی پێغەمبەر (ص)، پایەیەکی پێجگار گەورەیان پێبەخشیوە. کە "کاکڵە - مۆخ - ی خواپەرستییە" [(١٥)].

رەنگە جەوهەریترین هۆکاری بایەخدانی صۆفییان بەم چەمکە، جگە لەوەی چەمکێکی قورئانییە و فەرموودەکانیش جەختیان لەسەر کردووە، ئەوە بێت کە رەزامەندیی مەعشووق گەورەترین خواستی صۆفییانە، بەلای قوشەیرییەوە ئەم ئایەتە پیرۆزە: **المنافِقُونَ والمنافِقَات بعضهم مِن بعضٍ يأمرونَ بالمنكَرِ وينهونَ عنِ المعروفِ ويقْبِضونَ أيدِيهم نَسوا اللّـه فَنَسِيهم إنَّ المنافِقِ هم الْفَاسِقُونَ / التوبة ٦٧** سەرزەنشتکردنی خوایە بۆ "کەسانێك کە دەستیان لە پاڕانەوە هەڵگرتووە"[(١٦)]، چونکە مەعنای ئەو بەشەی ئایەتەکە کە لێرەدا هێنراوەتەوە: "دەستیان دەنوقێنن"ە، کە پێچەوانەی کردنەوەیەتی، لە پاڕانەوەشدا دەبێ دەستکراوە بێت و تا ئاستی شان بەرز کرابێتەوە.

بەلای "عەرووسی"یەوە وشەی "دعاء"، مەعنای داخوازیی رەهاکراو دەبەخشێت، و بە زۆری هەر لە خوارترەوەیە بۆ سەرووتر، و بەوە لە زیکری جیا دەکاتەوە کە "بە زمان دەبێت لەگەڵ غافڵیی دڵ، یان بە ئامادەیی دڵ"، بەڵام ئەوەش دووپات دەکاتەوە کە "تەنها بە - دڵ - یش دەبێت. هەروەها پێیوایە کە هەر کاری "مورید"ەکانە و هی عارفەکان نییە، چونکە بە ئیرادەیان لە ئیرادەی خوادا تواونەتەوە، و ئیدی هیچ ئاوڕێکیان بۆ داخوازی نامێنێ، چونکە هێندەیان بەسە کە پێشتر لە رووناکییەکانی لوتفی خوداوەندییەوە بۆیان هاتووە. [(١٧)] بە بۆچوونی تایبەتی خۆشم، لەبەرئەوەی سەرلەبەری ئەزموونی صۆفیگەری کۆششێکی سەختە بۆ وەدەستهێنانی گۆڕانێکی بنەڕەتی لە ناوەوەی مرۆڤدا بە ئاراستەی لابردنی ئەو چینە ژەنگانەی دڵیان داپۆشیوە، ناکرێ بە تەنها پاڕانەوە و هیوا ئەو گۆڕانەی پێویستە وەدەستبهێنرێ، چونکە بناغەی هەر گۆڕانیک کە خوای گەورە بییەوێ لە خەڵکانێکدا بەدیبهێنێ، دەبێ خۆیان زەمینەی بۆ خۆش بکەن: **لَه معقبات من بين يديه ومن خلفه يحفظونه من أمر ا ـ إن ا ـ لا يغير ما بقوم حتى يغيروا ما بأنفسهم وإذا أراد ا ـ بقوم سوءًا فلا مرد له وما لهم من دونه من والٍ/ الرعد ١١** . بەلام سەرچاوەکانی صۆفیگەری زۆر جەخت لەسەر دوو خاڵی گرنگ دەکەن کە کاریگەریی گەورەیان هەیە لە

سەرخستنی کۆششی نزیکبوونەوە لە مەعشووق، و بۆ ئەو بۆچوونەش پاڵپشتی زۆریان لە قورئان و فەرموودە قودسییەکاندا هەیە، ئەو خاڵانەش ئەمانەن:

١. هەر کارێکی خۆبەخشانە "تطوع"ی پتر لەوەی فەرزکراوە بەسەر بەندەدا، بەو مەرجەی دڵسۆزانە بۆ رەزامەندیی خوا بێت، دەبێتە مایەی وەدەستهێنانی رەزامەندی و نزیکبوونەوە لە خوا و خۆشەویست بوون لای، بە بەڵگەی فەرموودەی قودسیی: "ئەوەی دژایەتیی یەکێك لە وەلییەکانم بکات ئەوا جەنگی لە دژ رادەگەیەنم. بەندەشم بە هیچ شتێك لێمەوە نزیك نابێت هێندەی ئەو شتانە بەلامەوە خۆشەویست بێت کە بەسەریدا فەرزم کردوون. بەندەشم هەر بە زێدەخواپەرستی (النوافل) لێم نزیکدەبێتەوە تا دەگاتە ئەوەی خۆشمبویٚ، کە خۆشمویست دەبمە ئەو گوێیەی پێی دەبیستیٚ و ئەو چاوەی پێی دەبینیٚ و ئەو دەستەی پێی لێدەدا و ئەو پێیەی پێی دەڕوا. ئەگەر داواشم لیٚ بکات بیٚ بەشی ناکەم و ئەگەر پەنام بۆ بێنی پەنای دەدەم" [١٨].

٢.بیرکردنەوە "التفکر" لە بەڵگەکان "آیات"ی خوا و زیکر[١٩] کردنی بە دەم و دڵ بە بەردەوامی، ئەو بەڵگانەش کە بۆ کاریگەریی بیرکردنەوە و زیکر هەن زۆرن، لەوانە: **أولم يتفكروا فِي أنفُسِهم ما خلَق الله السماواتِ والأرض وما بينهما إلا بِالحـق**

**وأجلٍ مسمى وإن كثيرا من الناس بلقاء ربهم لكافرونَ/ الروم ٨**
و دەیان ئایەتی دیکە. گرنگیی گەورەی زیکر لە قورئانی پیرۆزدا لەوەدایە لە چەندین شوێندا خودی قورئان بە "ذکر" ناوبراوە، لەوانە: **وإن يكاد الذين كفروا ليزلقونك بأبصارهم لما سمعوا الذكر ويقولونَ إنه لمجنونٌ / القلم ٥١** ، یان بە خاوەنی زیکر ناوبراوە. هەم بەرپرسی بێ ئاگایی - غافڵ بوون - لەو زیکرە:
**واصبر نفسك مع الذين يدعونَ ربهم بالغداة والعشي يريدونَ وجهه ولا تعد عيناك عنهم تريد زينةَ الحياة الدنيا ولا تطع من أغفلنا قلبه عن ذكرنا واتبع هواه وكانَ أمره فرطًا / الكهف ٢٨ . ص والقرآن ذي الذكر/ ص ١** ، یان بە ئاسان کراوە بۆ (ذکر)، وەکو: **ولقد يسرنا القرآنَ للذكر فهلْ من مدكرٍ / القمر ١٧ .**
هەروەها کتێبە ئاسمانییەکانی دیکەی وەکو "تەورات" و "ئینجیل"یش هەر بە "ذکر" ناوبراون، وەکو: **وما أرسلنا من قبلك إلاَّ رجالاً نوحي إليهم فاسألوا أهلَ الذِّكْر إنْ كنتم لا تعلمونَ / النحل ٤٣ .** یەکێك لەو خاڵە ئێجگار گرنگانەش کە قورئانی پیرۆز بە روونی ئاماژەی بۆ کردووە و لە ئەزموونی صۆفیگەریدا شوێنێکی ئێجگار تایبەتی هەیە ئەوەیە کە "دڵ" هەم مەڵبەندی زیکرە، و لە فەرموودەکانیشدا، بە تایبەت فەرموودە قودسییەکان، زیکر پایەیەکی زۆر گەورەی هەیە.. ئەوەتا لە فەرموودەیەکی قودسیدا بە رێگەیەکی زۆر کاریگەری

نزیکبوونەوە لەخواوە باس دەکرێ: (من لە ئاستی گومانی بەندەی خۆمم بە من، و لەگەڵیدام لەو شوێنەی زیکرم دەکات. ئەگەر لە ناخی خۆیدا زیکرم بکات - ناوم بێنێتە سەر زمان -، لە ناخی خۆمدا باسی دەکەم. ئەگەر لەنێو کۆمەڵە خەڵکێکدا زیکرم بکات - ناوم بێنێتە سەر زمان - لە کۆمەڵێکی لەوان باشتردا باسی دەکەم. ئەگەر بستێك لێم نزیکببێتەوە یەك "باع"[20] لێی نزیك دەبمەوە. ئەگەر بە رۆیشتنی ئاسایی بێتەلام، بە هەنگاوی خێرا - هرولة - دەچمە لای[21]. لە فەرموودەیەکی قودسیی دیکەدا هەمان پاڵپشتی و نزیکی، بە شێوەیەکی دیکە دووبارە دەبێتەوە: (من لەگەڵ بەندەی خۆمدام تا ئەوکاتەی زیکرم بکات و لێوەکانی بە من بجووڵێن) [22].

بە پشتبەستن بەو زەمینە بەهێزەی گرنگیی زیکر بۆ نزیکبوونەوە لە خۆشەویست، کە لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکاندا بەدی دەکرێ، لە ئەدەبییاتی ئەم ئەزموونەدا، بە درێژایی مێژوویەکی دوور و پڕ بەرهەمی گرنگ، ئاوڕ لەم چەمکە دراوەتەوە. موحاسیبیی مامۆستای گەورەی قوتابخانەی صۆفیگەریی بەغدا، هەردوو چەمکی "زیکر" و "غەفڵەت - بێ ئاگایی" بەرانبەر بە یەك دادەنێت و یەکەم بە دەروازەی رزگاربوون لە دووەم دەزانێ، و ڕێگەی رزگاری لە زانینی هەموو گوناهەکاندا دەبینێ بە وەبیرهێنانەوەی هەموو ساتەکانی تەمەنی

رابوردووو[٢٣]، هۆش - عەقڵ - و زانست - زانین - و دڵنیابوون - التثبت - بە تاکە ڕێگەی جیاکردنەوەی باشی و خراپی خولیاکان - الخطرات - دەزانێ [أ-٢٣]. لە دەستنیشانکردنی هۆکار و ڕێگاچارەی نەخۆشییەکانی دڵدا، موحاسیبی پەنا دەباتەبەر شیکردنەوەیەکی وردی ئەو توخمانەی بە شێوەیەکی شاراوە و بە قووڵی کار دەکەنەسەر دەروونی مرۆڤ، دەڵێ: "بناغەی هەر بەڵایەك بەسەر دڵدا بێت، بە حوکمی پێویستی، لە بەرهەمەکانی خۆتێخزاندن - الفضول -ە، و بناغەی ئەوەش چوونەنێو دنیایە بە نەزانی و لەبیرچوونەوەی ڕۆژی بووژانەوەیە، ڕێگەی رزگاربوون لەوانەش پشتکردنە لە هەموو نەزانراو - مجهول -ێك لە رووی خۆپارێزی "الورع"[٢٤]ەوە، و دەستگرتن بە هەموو زانراو - معلوم -ێك لە رووی دڵنیاییەوە "[٢٥]. نموونەی هەرە گەورەی بژێویی راستەقینەی دڵ ئەو حاڵەتی زیکری بەردەوامەیە کە پێغەمبەر (ص) هەیبووە، کە موحاسیبی ناوی "ئاوەدابیی دڵ بە زیکری خوا" [٢٦] ی بۆ هەڵبژاردووە.

بە گەڕانەوە بۆ هەمان ئەو "بێ ئاگایی - الغفلە"یەی موحاسیبی وروژاندی، گەورە صۆفییەك تەنها نەمانی ئەو بێ ئاگاییەی بە زیکر لە قەڵەم داوە: "ئەگەر بێدەنگیش بیت هەر زیکرت کردووە"[٢٧]. بەلای قوشەیری/شەوە هەردوو زیکری زمان و دڵ کۆڵکەی پتەوی ڕێگەی روو لە خوا کردنن و "سەندنەوەی

ئەو زیکرە - لە کەسێك - یەکسانە بە گۆشەگیرکردنی[٢٨]، و لە ڕوونکردنەوەی مەبەست لە "ڕوونبوونەوەی ئاوێنەی دڵ"، کە ئەنساریی ڕاڤەکاری - الرسالە القشیریە - بەکاریهێناوە، مستەفا عەرووسی دەڵێ: "واتە: بێگەردی ڕوونکردنەوەی دڵ بە زۆریی زیکر و بیرکردنەوە و داوای لێخۆشبوون[٢٩]، شێخ عەبدولقادری گەیلانی/ش زیکری شاراوەی دڵ بە زیکری ڕاستەقینە دەزانێت و دەڵێ: "زمان کارەکەر و پاشکۆی دڵە"[٣٠].

لە کتێبەکانی فەرموودەدا پاڕانەوە - دوعا - و زیکر پێکەوە ناویان دێت، و بەشێکی باشی ئەو کەسانەی هەوڵیانداوە سوننەتەکانی پێغەمبەر (ص) بە پەیڕەویکارانی بناسێنن تێکڕای پاڕانەوە و زیکرەکانی هەموو کاتە جۆربەجۆرەکانیان کۆکردۆتەوە، و کارەکانیشیان بە "کتب الاذکار و الادعیة" دەناسرێن. لێرەوە دەکرێ پەی بەو ڕاستییە ببرێت کە پاڕانەوەش، ئەگەر لە دڵێکی پڕ سۆوی ڕاستەقینەوە هەڵبقووڵێ کارایە، و دوعای ستەم لێکراوانیش دیارە چەند کارایە، بەڵام پەیوەندیی بەم مەبەستەی ئێرەوە نییە.

بە گشتی، دەکرێ دووەمین بەیت بەمجۆرە "فلاش باك"ێکی چیرۆکی عاشق لە عیشقەکەیدا لە قەڵەم بدرێ، بەو مەعنایەی پاڕانەوەکە قۆناغی پێش چوونە نێو ئەزموونەکەیە، نەیتوانی ڕۆڵێك لە بواری ڕاکێشانی سەرنج و وروژاندنی بەزەیی

مەعشووق ببینیٚ و **هیچی** لیٚ شین نەبوو، چونکە لەسەر بنەمای توانــــەوەی خود بنیادنەنرا بوو، و لەبەرئەوەی سوورم لەسەر ئەوەی بە گرتنەبەری شێوازی گونجاو "سووتان" لە دەیری عیشقدا جیٚ بگرم، وا بە کردەوە روو لە ئەزموونەکە دەکەم: با بسووتێم و ببمە خاکی رێی.

دووەمین بەشی دووەمین بەیت "**طەریقەی گۆشەگیری بەردەدەم، ئەمجارە ریٚ دەگرم**" نەك تەنها پاڕانەوەی بە "گۆشەگیری" لە قەڵەم داوە، کە لە بنەڕەتدا ئەمە پاڵپشتێکی گەورەی ئەو راستییەیە کە "گۆشەگیری" دابڕانە لە مەعشووق و بەمەش ناکریٚ بە ئەزموونی عیشقەکەوە پەیوەست بیٚ، بەڵکو بە "طەریقە"، واتە: "رێباز - رێچکە"ش ناوی بردووە. ئەمە **هەڵبژاردنی** پێشوو بوو کە ئێستا رەتی دەکاتەوە: "**بەردەدەم**". لە بەرانبەریشدا **هەڵبژاردنەکەی** دیکە، کە بەپێی مەنتیقی ئەم شیعرە دەبیٚ ئاڕاستەیەکی بە تەواوی جیاواز، بەڵکو **هاودژیشی** هەبیٚ، تەنها بەم شێوەیە تەعبیری لیٚ کراوە: "**ئەم جارە ریٚ دەگرم**". واتە بە ئاسانی و بە روونی وشەی "**ریٚ**" بەرانبەر بە "**طەریقەی گۆشەگیری**" دانراوە، هەروەها "**بەردانی طەریقە**" بەرانبەر بە "**ریٚ گرتن**". دەستنیشانکردنی ئەم بەرانبەرکیٚ پێکردنانە بەرەو کوێمان دەبات؟

وشەی "**طريقة**" - رێباز یان رێچکە"، لە زمانی عەرەبیدا

لـــە وشـــەی "**طریــق**" - ڕێ، ڕێگــە - وە وەرگــێراوە، ئەمـــەش دەتوانــێ ئاماژەیــەکی بــەهێز بێــت بــۆ ئــەوەی ئــەو وشــەیە ڕێـك شێوازی جێبەجێکردنی ئەرکێکمان دەخاتە مێشکەوە، وەك چـۆن "**ڕێگـا**" ئــەرکی گەیــشتن - گەیانــدن - بــە شــوێنێکی دیــاریکراو دەگرێتەئەســتۆ، (جێبــەجێکردن)یــش شــێوەیەکە لــە شــێوەکانی گەیــشتن.. واتــە لــە هــەردوو حاڵەتــدا دەبــێ ئــەرك - کۆشــش -، ئــامراز و دەرەنجــام هــەبێ، بــەڵام وا نییــە. لــە ســەرەتاوە وشــەی "**گۆشەگیری**" بوونی کۆشش و ئامرازی فیعلی ڕەت دەکاتەوە. لە سایەی ئەمەشدا با "ئەرك" **هەبێ**، بەڵام ناتوانرێ بـاس لـە بوونـی "دەرەنجام" بکرێ. ئەمەش ڕێك هاوشێوەی ئەو پاڕانەوە "**دوعا**" یەیە کە بە کردەوە هەوڵنادرێ ناخ بەو ئاڕاستەیە بگۆڕدرێ کە لـە پێناویدا مرۆڤ دەپاڕێتەوە. کەواتە ئەو "**طەریقە**"یە، لـە ڕوانگـەی شــاعیرەوە، تــەنها ڕێبــازێکی تیۆرییــە، و دوور لــە ڕەچــاوکردنی پێداویستییەکانی بـە ئـەنجام گەیـشتن، ڕەنگڕێـژی کـراوە. بۆیـە، لەبری ئەوەی کارلێك - تفاعل -ی تێدا یەدی بکرێ و ببێتە مایەی ئەوەی لە دەیـری عیـشقەوە نزیکـی بکاتـەوە، بـە تـەواوی عاشـق گۆشــەگیر دەکــات و دایــدەبڕێ. هــەر ئــەمجۆرە تێگەیــشتنەش دەتوانــێ ببێتــە پاســاوی ئــەوەی بەرانبــەرکێ بــە "**طــەریقــەی گۆشــــەگیری**" و "**ڕێ**"کــــراوە. بــــەو شــــێوەیەی کــــە بــــەردان: "**بەردەدەم**" لە بەرانبەرگرتن "**دەگرم**"دا دانراوە. ئاشکراشـە کـە

لـە بـەکارهێنانی زمانـەوانی ئاسـاییدا هـەردوو وشـەی **"گـرتن"** و **"بـەردان"**، بـە کـردەوە، بەرانبـەر و پێـچەوانە و هـاودژی یـەکن. هەروەها وشـــەی **"ئەمجارە"**، ئەگەرچی لە بەیتەکـەدا بـە تەنـێ هاتووە، لە راسـتیدا بەرانبـەر بـە **"جـاری پێـشوو"**ی بـە شـێوەی راستەوخۆ باس نەکراو هاتووە. **"ئەمجارە"** ناکرێ بە دابـڕاوی لـە رەوتـــی گـــشتی بـــیری لێ بکرێتـــەوە. بـــە کـــردەوەش هەوڵێکـــی سەرنەگرتوو لە ئارادا بوو: **"پاڕانەوە - دوعـا"**، کە عاشــق خۆی بە پیادەکردنـــی **"طەریقەی گۆشەگیری"**ی لـە قەڵـەم دابـوو، ئـەو هەوڵە هەرچـەندی خایانـدبووبێ، بـە گشتی و بـەلای کەمـەوە لـە روانگەی حوکمی ناخی شاعیرەوە، کاتی بەسەر چووە و بـووە بـە رابـوردوو. لــە بەرانبەریـشدا، بڕیارێـك لــە ئارادایــە بــۆ گۆڕینـــی ئاڕاستەی ئەو هەوڵە بەرەو لایەکی جیاواز، بەڵام بە بەڵگـەی **"جا دەبمە خاکی رێی"** و **"ئـەمجارە رێ دەگـرم"**، جێبەجێنـەکراوە و بـۆ داهــاتوو دانـراوە. ئـەم بڕیـارە تازەیـەش هــەر هەوڵـە و تـا دەرەنجـــامی فیعلـــیی لێ نەکەوێتـــەوە نـــاتوانرێ بـــە کـــردەوە هەڵبسەنگێنرێ، ئەگەرچی بەپێی مەنتیقی ئەزموونەکە، هەوڵێکـی بنیاتنراوە لەسەر بنەما تـاقیکراو و سـەرکەوتووەکان، لەبـەر ئـەم هۆیەش، دەکرێ سەرجەمی دووەمین بەیت بە "بەخۆداچـوونەوە" یەکی بەجێ لە قەڵەم بدرێت، و لێرەش بە دواوە شـاعیر لـە چـەند وێـستگەیەکی ئەزموونەکەیـدا رامانـدەگرێت، تـا دەگاتـە دوو دوا

بەیت.

**"کە دادی یەئسی خۆمم بردە لا"**، لێکدانەوەی ئـەم بەیتـە یەکێکە لە جوانترین و وردترین و سـەرکەوتووترین لێکدانەوەکانـی دیوانی مەحوی، بنەماکانی ئەم سەرکەوتنەش لە پێکەوە گرێدانـی ئەم سەرە - دەزووانەدایە:

- ئەو شێوە خۆشەویستییە باوە رەچاونەکراوە، کـە لـە زۆربـەی بەیتـەکانی دیکـەدا بـەدی دەکـرێ. بـە پێـچەوانەوە راستەوخۆ هۆی یەئس "بێوەری"ی عاشق دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی: "بۆچـی هێـشتوومیەتەوە و بـۆ نـامکوژی"، کـە ئـەمجۆرەی لێکدانەوە ئەگەری ویستنی یار بە مەبەستی فیزیکی "جەستەیی" دووردەخاتەوە.

- بەستنەوەی هـەردوو وشـەی "عارفـە" و "جـەژن" بـەو مەبەسـتەوە کـە بـاس کـرا، واتـە: "کوشـتن"، بـە شـێوەیەکی راستەوخۆ، بەو مەعنایەی کە جەژنی قوربـان بێـت نـەك "جەژنـی رەمـەزان" یـان هـەر جـەژنێکی دیکـە. ئـەمجۆرە گرێدانـەش، بـە شێوەیەکی ئێجگار بەرچـاو و روون، لـە لێکدانـەوەی صـۆفییانەی ئـەو بەیتـەوە نزیکمـان دەخاتـەوە، چـونکە تـەنها لـە عیـشقی راسـتەقینە - حـەقیقی - دا عاشـق بـە دوای نـەمانی خۆیـدا، بـە دەست مەعشووقەوە، یان لەنێو مەعـشووقدا - توانـەوە، فـەنا - دەگەڕێت، و ئەگـەر بڕیـاریش بێـت، لـە عیـشقی - مـەجازی - دا

لەنێو بچێت، ئەوا تەنها بە هۆی ناکامیی عیشقەکەوەیە، واتە نەگەیشتن بە مەعشووق، نەك بەوەی خۆی بە دوای ئەو لەنێوچوونەدا بگەڕێ.

**"کە دادی یەئسی خۆمم بردە لا"** راپۆرتی راستەوخۆی شاعیرە لەبارەی بە بنبەست گەیشتنی خۆیەوە. ئەوەی بە دڵنیاییەوە لەم راپۆرتەدا بەدی دەکرێت دوو خاڵە: یەکەمیان: یەئس "بێوەری - نائومێدی"ی عاشقە، و دووەمیشیان: سکالأیە لە دەست ئەو هەلومەرجەی ئەو نائومێدییەی دروستکردووە، ئەو سکالأیە؛ بەپێی رێوڕەسمی ئەم ئەزموونە، تەنها لای یار خۆی تۆمار دەکرێت: **وعلى الثلاثة الذين خلفوا حتى إذا ضاقت عليهم الأرض بما رحبت وضاقت عليهم أنفسهم وظنوا أنْ لا ملجأ من الله إلا إليه ثم تاب عليهم ليتوبوا إن الله هو التواب الرحيم / التوبة ١١٨** هێندەی پەیوەندیی بە چەمکی "یأس - یەئس"ەوە هەبێ، کە وشەیەکی عەرەبییە و مەعنای "بێوەری - نائومێدی" دەبەخشێ، چ لە سەرچاوەی ئایینییەوە - رێك لە چوارچێوەی چەمکە قورئانییەکاندا -، و چ لە بواری چەمکە بناغەییەکانی ئەزموونی صۆفیگەریدا، بە چەمکێکی گونجاو و بەجێ لە قەڵەم نادرێت. لە قورئاندا ئەو چەمکە لە ئایەتێکدا بە گومڕایی "ضلال"ەوە بەستراوەتەوە: **قالَ ومن يقْنطُ من رحمةِ ربهِ إلا الضالونَ/ الحجر ٥٦** ، لە ئایەتێکی دیکەشدا بە بێ بڕوایی

"کفر" ەوە بەستراوەتەوە: **یا بنِي اذْهبوا فَتحسّسوا مِن یوسـف وأَخِیهِ ولا تیئَسوا مِن روحِ اللّهِ إِنّه لا ییئَس مِن روحِ اللّهِ إِلاّ الْقَوم الكَـافِرونَ / یوسـف ٨٧)**[٣١] . لـەو دوو ئایەتـەدا یەئـس "نائومێـدی" یەکـە لـە رەحمـەتی خوایـە، کـە بـێ باوەڕییـە بـە رەحمان - میهرەبان - و رەحیم - بە بەزەیی - بوونی خوا، کە دوانـن لـە نـاوە جوانـەکان - الاسمـا الحـسنی -ی. ئـەمجۆرە نائومێدبوونـەش پەکخـستن - تعطیـل -ی ئـەو سـیفەتەیە کـە صۆفییان بڕوای تەواویان پێیەتی بایەخی زۆری پـێ دەدەن، و لـە گەوهەریـشدا سەرچـاوەی لوتفـی بـێ پایـانی خوداوەنـدە. ئـەو سیفەتە لە قورئـانی پـیرۆزدا هێنـدە گشتێندراوە کـە بـە تـەواوی هەموو شتێك بگرێتـەوە: **اَلّذِین یحمِلُونَ الْعـرش ومـن حولَـه یسبِّحونَ بِحمدِ ربِّهم ویؤمِنونَ بِهِ ویستغفِرونَ لِلّذِین آمنـوا ربّنـا وسِعت كُلّ شيءٍ رحمةً وعِلْما فَاغْفِر لِلّذِین تابوا واتّبعوا سـبِیلَك وقِهم عذاب الْجحِیمِ / غـافر ٧** ، و تەنانـەت ئەوانـەش کـە لـە گومڕایـی و خـۆ ونکردنـدا زێـدەڕۆییان کـردووە، هێـشتا هـەر لـەو رەحمەتە بێبەش نـاکرێن. **ولَقَد آتینا موسى الْهدى وأَورثْنا بنِـي إِسرائِیلَ الْكِتـاب / غـافر ٥٣** ، لێـرەوە صـۆفییە گـەورەکان هەمیـشە خۆیـان لــە نائومێـدی دوور خـستۆتەوە فەرهــەنگ و ئەدەبییاتی تایبەتیان لەو چەمکانە پاککردۆتەوە.

لــە راســتیدا زۆر گرنگــە ســەرنجی ئــەوە بــدرێت کــە "نائومێـدی" لەگـەڵ بوونـی ویـست - ارادة -دا ناگونجێـت، کـە سـەرەکیترین مـەرجی روو لـە ئـەزموونی صـۆفیگەری کردنـە، و تەنانەت ئەوەی بە کردەوە لـەو ئەزموونـەدا دەست بـە وەرزشـی رەوانــی بکــات پێیــدەگوترێ "موریــد"، واتــە خــاوەن ئــیرادە. هەروەها نائومێدی لەگەڵ مەقامی "صبر"، واتـە ئـارامگرتن/یـشدا نـاگونجێ، کـە مـەقامێکی سـەرەکیی صـۆفیگەرییە، و لـە هـەموو مەقامەکانی دیکەدا بنەمایەکی سەرەکییە. لەم روانگەیەوە، دەبێ ئــەو "دادی یــەئس"ەی لێــرەدا بــەدی دەکــرێ بــە هەڵپــەی تازەکــارێکی پــاڵنراو بــە تاســە و تامــەزرۆی زوو گەیــشتن لێکبدرێتــەوە. ئـەم هەڵپەیـە، ئەگەرچـی - لـە روانگـەی تەمەنـی ئەزموونەوە - پاسـاوی خـۆی هەیـە، بـەڵام نـاکرێ وا بـە ئاسـانی چاوی لێ بپۆشرێ... وەڵامەکەش بە روونی لە خودی ئـەو بەیتـەدا دیارە: "**توند بوو**"، واتە تووڕە بوو. ئەم وەڵامە دەکرێ هـی "**داد بردنە لا**" بێ، و دەکرێ هی "**یەئس**"ەکە بێ. ئەگەر وەڵامی داد و بێدادی عاشق بێت، ئەوا وێڕای بە "نابەجێ" زانینی ئەو رەفتارە، واتــە ســکاڵاکردن، دەکــرێ هــۆی توندبوونەکــەش بــۆ ئــەوە بگێڕدرێتــەوە کــە هەڵبژاردنەکــە هــی خــودی شــاعیرە -خــودی عاشق-، بۆیە دەبێ سکاڵا لە خۆی و لای خـۆی بکـات، واتـە هـەر سکاڵا نەکات، بەڵگەی ئەمەش لە خودی ئەو غەزەلە، لە یەکەمـین

بەیتدا بەدی دەکرێت: **"جێ بـە سـووتن بـێ لـەوێ دەگـرم"**. خـۆ ئەگەر ئەگەر وەڵامی یەئس "نائومێدی"یەکەش بێت، ئەوا جگە بە پەســەند نەزانینـــــی لـــە هـــەردوو رووی ئـــایینی و مەنتیقـــی ئەزموونەکـــەوە، دەبوو لە ســـەرەتاوە، لـە هەڵبـــژاردنی **"دەیـری عیشق"** **"بە سووتن"** و بە **"بەردانی طەریقەی گۆشەگیری"** و بـــە **"رێ گرتن"** بزانێت کە ئـــەم "رێ" یە **"هەوراز و نشێوی"** ئێجگار زۆرە، و ناکرێ مرۆڤ لافی "رێبوار بوون" لێ بدات و لە ماندووبوون خۆی بپارێزێ، چونکە هەر خۆی دەڵێ:

**کێوی غەم، وادیی جەفا طەی کردنە ئەشراطی عیشق**
**باکی هەوراز و نشێوت کەی دەبێ گەر رەهـــــڕەوی**
١٢ ی ٢ ل ٣١٧

"ئەم عارفـە" بـۆی هەیـە بـەو شـێوەیە لێـك بدرێتـەوە کـە ئاماژەیە بۆ رۆژی پێـش جـەژن بـە گـشتی، و جـەژنی قوربـان بـە تایبەتی –بە پێی نیسبەت دان بە لای عەرەفاتدا–: **لَيس عليكُم جناح أنْ تبتغوا فَضلاً مِن رّبكُم فَإذَا أَفَضتم مِن عرفَاتٍ فَاذْكُروا اللّه عِند الْمشعرِ الْحرامِ واذْكُروه كَما هداكُم وإنْ كُنتم مِن قَبلِهِ لَمِـن الضّالّين / البقـرة ١٩٨** ، و بـۆی هەیـە ئامـاژە بێـت بـۆ وشـەی "عـاریف" نـەك "عارفـە"–وەکـو لـە لێکدانـەوەی مامۆسـتایاندا هاتووە – لێکبدرێتەوە. لێکدەرەوانی دیوان ئاماژەیان بـۆ هـەردوو

ئەگـەری لێکدانەوەکـە کـردووە. ئەگـەر کـات –ڕۆژی عارفـە، ڕۆژی پێش جەژن –بێت، ئەوا مەسەلەی وەرگرتنی شەرەفی بە قوربانـی بوون–وەکو لە ئامادەیی حەزرەتی ئیسماعیل(د. خ) لـە قورئانـی پیرۆزدا بەرجەستە دەبێ - دێتـە ئـاراوە: **فَلَمّا بلغَ معه الـسّعي قالَ يا بنيّ إِنّي أرى فِي الْمنامِ أَنّي أذْبحك فَانظُر ما ذا ترى قالَ يـا أبتِ افْعلْ ما تؤمر ستجِدني إِنْ شاءَ اللّه مِن الصّابِرين**[32]**/ الصافات ١٠٢** ، لێرەشـــدا دوو گرێـــی بـــچووك دێنـــەئاراوە: یەکـــەمیان نائومێدبوونی پێش وادەی عاشقە **"کە دادی یەئـسی خـۆمم بـردە لا، ئەم عارفە"**، چونکە کاتی ڕاستەقینەی قوربانی ڕۆژانی جەژنە، نـەك ڕۆژی عارفـە. ئـەم گرێیـەش بـەوە دەکرێتـەوە کـە لەوانەیـە عاشق یان گومانی ئەوەی لا دروست بـوو بـێ کـە مەعـشووق ئـەو نەزری بە قوربانی بوونەی لێ قەبووڵ نەکردووە، یان هەر ئاوڕی لێ نەداوەتەوە. دووەمیشیان ئارامنەگرتنە لەسەر مەسەلەیەك نـاکرێ بـــە بێئـــارامی مامەڵـــەی لەگەڵـــدا بکـــرێ. هەڵبەتـــە لـــە ئایەتـــە لێوەرگیراوەکـــەدا ئارامگرتنەکـــە لەســـەر ملکەچـــی بـــۆ فەرمانـــی سەربڕینە، سەرەڕای ئەو هەموو ئازارە گەورەیەی بە قوربانی کراو چـــاوەڕوانیەتی، بێئارامییەکـــەی عاشـــق لـــەو دەقـــەدا لەســـەر ڕووننەبوونـەوەی ئەوەیـە: ئایـا ئامـادەیی خۆبەختکردنەکـەی، لـە لایەن مەعشووقەوە، پەسەندکراوە یان نـەء؟ ئەگـەر خوێندنـەوەی **"ئەم عارفە"** بەم شـــێوەیە بێـت **"ئـەم عاریفـە"**، ئـەوا وشــــەی

"عـاریف" دەبێتـــە مەبەسـتی ئامـاژە بۆکـردن – پەنجـە بـۆ راکێـشان – و هێڵـە سـەرەکییەکانی لێکدانـەوەی بەیتەکـەش دەگۆڕدرێت. لە لایەکەوە راستە "عـاریف" مـەعنای "خوانـاس" دەبەخـشێ، بـەلاَم خـاوەنی چ جـۆرە "خواناسـی" یـەك و لـە چ روانگەو نیگایەکەوە؟ صۆفییەکان بایەخێکی گەورە دەدەنە چەند ئایەتێکی پیرۆز، کە راستەوخۆ وشـەی "معرفـة" یـان تێـدا بـەدی ناکرێ، لەوانە: **وما قَدروا اللّه حقّ قَدرِهِ إذْ قَالُوا ما أنزلَ اللّه علَى بشرٍ مِن شيءٍ قُلْ من أنزلَ الْكِتاب الَّذِي جاءَ بِهِ موسى نورا وهدى لِلنّاسِ تجعلُونه قَراطِيس تبدونها وتخفُونَ كَثِ ا وعُلِّمتـم مـا لَـم تعلَموا أَنتم ولَا آباؤكُم قُلِ اللّه ثُمّ ذَرهم فِي خوضِـهِم يلْعبـونَ / الانعام ٩١ ، ما قَدروا اللَّه حقّ قَدرِهِ إِنّ اللّه لَقَوِيّ عزِيز /ا ج ٧٤ ، وما قَدروا اللّه حقّ قَدرِهِ والأرض جمِيعا قَبضته يوم الْقِيامةِ والسّماوات مطْوِيّات بِيمِينِهِ سبحانه وتعالَى عمّا يشرِكُونَ / الزمـر ٦٧** . کە قوشەیری دەڵێ: " لـە تەفـسیردا هـاتووە: خوایـان بـە شێوەی دروست نەناسیوە "[٣٣] [٣٤]. "ابو الحـسین النـوری"، کـە لێیپرسرا یەکـەمین شـت چ بـوو خـوای گـەورە بەسـەر بەندەکانـدا فـەرزی کـرد، گوتـی: " زانـین – المعرفـة – لەبـەر قـسەی خـوای گەورە: **وما خلَقْت الْجِنّ والْإِنس إِلّا لِيعبدون / الذاريات ٥٦** و "ابـن عبـاس"[٣٥] گوتوویـەتی: الا لیعرفونـی – تـەنها بـۆ ئـەوەی بمناسـن "[٣٦]. بـەم تێگەیـشتنەش مەبەسـت لـە دروسـتکردنی

فریشتە و مرۆڤیش دەبێتە ئەوەی خوای خۆیان بناسن، لە جەوهەریشدا صۆفیگەری لەسەر ئەوە بنیادنراوە کە تەنها دەتوانرێ کەسێك خۆشبویسترێ کە دەناسرێ. گرنگی ئەم مەسەلەیە لای صۆفییان هێندە بەرچاو و نکووڵی لێنەکراوە کە وشەی "عرفان" هاوشانی وشەی "تصوف" و وشەی "عارف" هوشانی وشەی "صوفی" بەکارهێنراوە. یان بەلای کەمەوە وشەی "عیرفان" بەرانبەر بە بواری "**ئەپستمۆلۆژی**" - تیۆریی زانین -ی صۆفیگەری بەکارهێنراوە. بایەخی ئەم بوارە تایبەتەی "ناسین" لەمجۆرە "خواناسی"یەدا بەدی دەکرێ لەوەدایە کە سەرچاوەی زانینی جیاوازە لە هەموو سەرچاوەکانی دیکەی زانینی بوارەکانی فەلسەفە و زانست، و تەنانەت جۆرە باو و ئاساییەکەی "خواناسی"ی ئاپینیش. لێرەدا سەرچاوەکە ئەزموونی صۆفیگەری خۆیەتی، کە سەنتەرەکەی "دڵ"ە. جێی ئاماژەیە کە مەحوی وشەی "عاریف"ی هەر بەو مەعنایەی لەم ئەزموونەدا مەبەستە، بەکارهێناوە، وەکو لەم بەیتەدا دەبینرێ:

**لە عاریف، عامییەك پرسی، هەواڵی مەصلەخ و قەصصاب**
**بە ئەنگوشتی شەهادەی کرد ئیشارەی مەحکەمە و نائیب**

٦ ب ٥ ل ٥٤

هــەروەها وشــەی "عیرفــان"یــشی، هــەر بــە هــەمان ئــەو مەعنایــەی لــەم ئەزموونــەدا مەبەســتە، بــەکارهێناوە، وەکــو لــەم بەیتەدا دیارە:

**قســـە و باسـت لە عیرفانە، کەچی دنیــأیــە مەنظــورت**
**لە عینــوانی جەواهـــیر جوویـیـــایی و روو لە ئەعراضی**

٦ ی ٥ ل ٣٠٥

وشـــەی "مـــەعاریف - زانراوەکـــان"یـــش هـــەر لەلایـــەن شاعیرەوە، بە هەمان ئەو مەعنایەی لـە ئەزموونەکـەدا مەبەسـتە، بەکار هێنراوە:

**کەمالاَت و مەعاریف مەبیە، بێ دەخڵی هەوێنی عیشــق**
**عەجەب پشـــکووتوە لەم جەذوە نارە پڕ بە عالەم نـــوور**

٤ ر ٤ ل ١٢٨

بەلاَم ئەوەی زۆر داهێنەرانـە هێناویەتیـەئاراوە ئەوەیـە کـە وشەیەکی کوردیی تازەی بەرانبەر بە "عارف"ی عەرەبی پێشنیاز کردووە و سەرچاوەی زانـین/یـشی لـە گەڵدا دەستنیـشانکردووە، ئەو زاراوە پێشنیازکراوەش، بە بۆچوونی من، گەلێ سەرکەوتووە:

**ئەوەندەی لێ دەزانم، بەم نەزانینی خۆمەوە "مەحوی"**

**بە چاوی سەر خودا بینە، بە چاوی دڵ خودازانـە**

بەحری نوور ٥٧ ل ٤٣٧

واتــە "خــودازان"ی بەرانبــەر بــە "خودانــاس"ی ئــەمڕۆ پێشنیازکردووە، کە بەم پێوەرە "عیرفان"یش لای شاعیر دەبێتـە "خودازانی"، و لەو بەیتەشدا روونە کە هەم "چـاوی سـەر"، واتـە دوو چـاوی ئاسـایی باسـکردووە، کـە ئاماژەیـە بـۆ شـەوڕەوییەکە "معراج"ی پێغەمبەر (ص)، و هەم باسی "چـاوی دڵ"ی کـردووە، کە بە بەرپرسی پرۆسەی "خودازانی"ی لە قەڵەم دەدات.

ئەگەر مەبەست لە "ئـەم عارفـە" ئەمـە بێـت کـە لـە چـەند دێڕی پێشوودا قسەی لەسەر کرا، ئەوا دەکـرێ خـودی مەعـشووق بێت، کە "عاریف" بوونەکەی جیاوازیی لە هـەموو "عـاریف"ێکـی دیکە هەیە، و زانینیشی هەمەلایەنە و بێ پایان و بێ هەموو جۆرە کەموکووڕییەکـە. یـان دەکـرێ مورشـید - رێبــەر - بێـت، کـە سەرچاوە و پاڵپشتی هەرجۆرە زانیاری و پێشکەوتنێکی عاشقە لە ئەزموونەکەیدا. بـەڵام بەشـی دووەمـی ئـەو بەیتـە، کـە گەوهـەری "توند بوون"، واتە تووڕەبوونەکەی عاریفـە، رێگـەمان پـێ نـادات "عاریف"ەکە بە کەسێکی دیکەی غەیری "مەعشووق" بزانین.

له لایەکی دیکەشەوە، باسکردنی جەژن له دووەمین بەشی ئەو بەیتەدا: **"وتی: ئاخر سبەینێ جەژنە خوێنی تۆ لە پێ دەگرم"**، زیاتر مێشکی خوێنەر بۆ لای ئەوە دەبات کە مەبەست لە **"ئەم عارفە"** رۆژی پێش جەژن بێت. لە سایەی ئەمەشدا، بە قایلبوون بەوەی مەبەست هەر "عاریف - خوداناس"ە، ئەوا دەبێ باس لە بوونی "تەوریە" لەم شوێنەدا بکەین. بەڵام ئایا ئەم لێکدانەوەیەی ئەم "عارفە" ئاراستە گشتییەکەی دەگۆڕێت؟ و تا چ رادەیەك؟ ئەگەر واش نەبێت، ئایا دەکرێ لێکدانەوەی سەرکەوتووی مامۆستایان بۆ "تەوریە"یەك بکرێتە قوربانی؟ با هێمنانە و بە وردی بگەڕێینەوە بۆ لای بەیتەکە، و سەرلەنوێ لێی ورد ببینەوە:

**کە دادی یەئسی خۆمم بردە لا، ئەم عارفە، توند بوو**
**وتی: ئاخر سبەینێ جەژنە، خوێنی تۆ لە پێ دەگرم**

با بێینە سەر ئەو رستەیەی تا ئێستا نەهاتووینەتە سەری: **"خوێنی تۆ لە پێ دەگرم"**. ئەم رستەیە لە هەموو روویەکەوە نائاساییە، و سرووش - ئیحا -ی سەرەکیی ئەم جۆرە دارِشتنەش ئەوەیە کە لە رق، یان لە خۆشەویستییەکی نائاساییەوە سەرچاوە دەگرێ.. لە رقێکی ئەستوور و نائاسایی ئەوتۆوە کە پاڵ بە خاوەنەکەیەوە دەنێت بۆ ئەوەی بیر لە جۆرێکی ئەوتۆی

تۆڵەسەندنەوە بکاتەوە کە لەگەڵ قەبارە و ئاست و ئاراستە و پاڵەپەستۆی رقەکەدا بگونجێت و گڕی کڵپەسەندووی ناخی خاوەنەکەی دابمرکێنێتەوە، "خوێن" لێرەدا، ئایا دەکرێ جێی خەنە بگرێتەوە!؟ "خەنە لە پێگرتن" لە دارشتنی کوردی و لە نەریتیشدا مەعنای ئامادەیی بۆ شایی و زەماوەند دەبەخشێ. ئەمەش، لە سایەی بیرکردنەوە لەوەی **"خوێنی تۆ لە پێ دەگرم"** بۆ تۆڵەسەندنەوە بێت، ئەوە دەگەیەنێ کە: بە کوشتنی تۆ زەماوەندی تایبەتی خۆم دەگێرم. بەلأم نە ئەم بەیتە و نە هیچ بەیتێکی دیکەی ئەم غەزەلە و نە گیانی گشتیی غەزەلەکەش رێگەی ئەوەمان دەداتێ، بە هەر شێوەیەك بێت، سەرەدەزوویەکی ئەوجۆرە رقە، یان پاساوی هەرجۆرە رق و کینەیەك بەدی بکەین، بە تایبەت لەبەرئەوەی چەمکی خۆشەویستی -عیشق- لەم ئەزموونەدا چەمکێکی رەهاکراو و گشتگیرە، بەو مەعنایەی خۆشەویستی لێرەدا چەترێکە هەموو بوونەوەران دەخاتەژێر سایەی خۆیەوە، چونکە رەنگدانەوەی توانای لە باس نەهاتوو و ئایەتی مەعشووقن.

کەواتە.. تەنها خۆشەویستییە نائاساییەکە دەمێنێتەوە، و لەم روانگەیەوە پێویستە جەخت بکرێ لەسەر ئەوەی ناتوانرێ بە دوای چوارچێوەیەکی سەرکەوتووتر لەوەی مامۆستایانی لێکدەرەوەی "دیوانی مەحوی"دا بگەرێین. رەچاوکردنی ئەو

چوارچـێوەیەش بـۆ هــەرجۆرە لێکدانەوەیـەکی پشتبەسـتوو بـە میتــۆدی صــۆفیگەری بــەرەو ئــەوەمان دەبــات کــە "یــەئس - نائومێدی"یەکەی عاشق بە هەڵپەیەکی پێشوەخت و هەرزەی ئـەو بــۆ گەیــشتن بــە قۆنــاغی توانــەوە لێکبدەینــەوە، و وەلاّمــی مەعشووق/یش مژدەیـەکی راسـتەوخۆی پەسـەندکردنی کۆشـشی عاشقە بۆ چوونەنێو ئەزموونەکەوە. پێکەوە گرێدانی "توند بـوو" و "ئاخر" بەرەو ئەوەمان دەبات کە وشەی "ئاخر" بـەو شـێوەیە لێکبدەینــەوە کــە هــۆی "تــووڕە بــوون - تونــد بــوون"ەکــە روونبکاتەوە. ئەو هۆیەش روونە: "نابـەجێیی یـەئس - نائومێـدی -"یەکەیــە، ئــەم نابــەجێی/یــەش بــەوەدا روونـدەبێتــەوە کــە "ســـبەینیَ" خـــۆی، واتـــە رۆژی جـــەژن، کـــاتی سروشـــتی قوربانییەکەیە، کەواتە ئەم پەلەکردنـەی لـە چـی و بـۆ چـی؟ ئـەم لێکدانەوەیــە لــە رووی شــێوەوە، نــەك لــە رووی ناوەڕۆکــەوە، ئایەتێکی قورئانی پیرۆزمان دێنێتەوە یـاد: **قالُوا يا لُوطُ إنا رسلُ ربك لن يصِلُوا إلَيك فَأسر بِأهلِك بِقِطْعٍ مِن الليل ولا يلْتفِت مِنكُم أحد إلا امرأتك إنه مصِيبها ما أصابهم إن موعِدهم الصبح أليـس الـصبح بِقَريـبٍ / هـود ٨١** . لێرەشـدا پێویـستە ئامـاژە بـۆ زاراوەیــەکی زۆر تایبــەت و گرنگــی صــۆفیگەری بکرێــت. کــە پێیدەگوترێ کات "الوقت"، و ئـەوەی لـەم زاراوەیـەدا، لـە بـواری ئەزموونی صۆفیگەریدا زۆر مایەی بایەخدانی تایبەتییە ئەوەیە کە

پێیدەگوترێ "کاتی صۆفی - وقت الصوفی"[٣٧]، پوختەی ئەم چەمکەش پەیوەندیی بە گرنگی کاتەوە لای صۆفی هەیە، و بەوەی دەبێ سوور بێت لەسەر ئەوەی لەوکاتەی خۆی تێیدایە، دەبێ بە قۆناغ و خاڵێکی تایبەتی ئەزموونەکەیەوە خەریك بێت، هەر بەوەوە خەریك بێت و لە شتی دیکەدا ئەوکاتەی بێهوودە نەفەوتێنێ. بە دارشتنێکی روونتر: هەموو قۆناغێك ئاراستەی تایبەت و ئەرکی تایبەتی لە چوارچێوەی زەمەنیی تایبەتی خۆیدا هەیە، و دەبێ صۆفی هەر بەو ئەرك و ئاراستەیە خەریك بێت، چونکە هەر ئەوە یارمەتیی دەدات لە سەرخستنی ئەزموونەکەیدا. دوو زاراوەی دیکەی گرنگی صۆفییانە هەیە بە چەمکی کات/ەوە بەستراونەتەوە، ئەوانیش هەردوو چەمکی "توانا - الاستطاعة"[٣٨]و" ساردبوونەوە - خاو بوونەوە - الفتور"ن[٣٩]. ئەو دوو چەمکە پتر پێویستی بەهەندوەرگرتنی کات لای صۆفی و بە فێرۆنەدانی دەخەنەروو، بەو مەبەستەی لە "سبەینێ"ی رەچاوکراویدا بەری ئەوە بچێنێ. بەلای مەحوییەوە "سبەی" کاتی وەرگرتنی ئەنجامە: "پاداشت" بێت یان "سزا"، بەیتی ( ٤م٣ ل ٢١٨) نموونەیەکە و ئەمانەش چەند نموونەیەکی دیکەن:

**<u>سبەینێ</u> (یحشر المرء) ە، براگەل، فرسەتە ئەمڕۆ**
**تەبەڕرا بن لە من، با کەس، نەبێ حەشری لەگەڵ حەشرم**

٥م ٧ ل ٢٢١

**هەڵـــە، پاڕانـــەوە ئەمـــڕۆ، زوبـــان و دڵ لە کـارایـە زوبان ئاوەر، کە بەسـتە زمانە سبحەینێ، کە قووچا دەم**

**٨م ٣ ل ٢٢٧**

**بەس ئەمڕۆ بڵێ من سبەی وا دەکەم هەموو (وا دەکەم) تە سبەی (وا ندم)**

**١٢ م ٢ ل ٢٣٦**

**لەگەڵ زانت دەکەویە کۆشی دنیا سبەی قاتیلتە، ئەمـــڕۆ بۆتە مامان**

**٣ ن ٤ ل ٢٤٣**

لەم گۆشـەنیگایەوە، و لـە چوارچـێوەی ئـەو هاوکێـشەیەی لێرەدا دەکرێ بەرپا بکرێ، دەتوانرێ "ئـەم عارفـە"، بـە مامەڵـە لەگەڵداکردنی وەکو "کات"، بە "ئەمڕۆ"ی کاتی عاشقی لە قەڵـەم بـدەین، واتـە ئـەمیان دەبێتـە "کێڵگـەی کـردەوە"ی عاشـق، کـە پێدەچـێ، بـە قەرینـەی دووەمـین بەشـی ئـەو بەیتـە، بەروبوومـی هـــەبێ و "ســـبەینێ" وادەی چـــنینەوە و ســـوودوەرگرتن لـــەو بەروبوومە بێت، بەڵام پێناچێ سـەرلەبەری ئەمـەی لـەم سـێیەمین بەیتەی غەزەلی (٤ م)دا بـەدیمان کـرد بوونێکـی پایـەداری هـەبێ، ئەمەش پاساوی خۆی هەیە.

لە ئەزموونی صۆفیگەریدا توانەوە لە زاتی خوادا - الفنا فی الله - مەقامە، واتە حاڵ نییە، و رێگای مانەوە بە خودا - البقا بالله -ە، کە ئەمیشیان هەر مەقامە. مەقام/یش، لەم ئەزموونەدا درێژە و کورت نییە، بە پێچەوانەی حاڵ/ەوە، کە ئێجگار کورتە. ئەگەرچی ئەم درێژییەی مەقام بەو مەعنایە نییە کە ئیدی پایەدار و جێگیر بێت، بەلاّم کاریگەریی، لە هەموو روویەکەوە و بە هەموو پێوەرێك، ئێجگار قووڵ بەسەر کەسایەتی و ئەزموونی سالیکەوە.

لەلایەکی دیکەوە، بەپێی هەر خوێندنەوەیەکی بۆ لایەنەی ئەزموونی صۆفیگەری، پێدەچێ "فەنا" و "بەقا" پاڵپشتێکی گەورەیان لەم فەرموودە قودسییەدا هەبێ " **من عادى لي وليا فقد آذنته بالحرب، و ما تقرب اليَّ عبدي بشئ احبَّ الي مما افترضت عليه، و مايزال عبدي يتقرب الي بالنوافل حتى احبه، فإذا احببته كنت سمعه الذي يسمع به و بصره الذي يبصر به و يده التي يبطش بها و رجله التي يمشي بها، و إن سألني لأُعطينه و لئن استعاذني لأعيذنه و ما ترددت عن شئ أنا فاعله ترددي عن نفس المؤمن يكره الموت و أنا أكره إساءته**"[٤٠]. ئەم فەرموودەیە، جگە لەوەی لە چەندین کتێبی بناغەیی فەرموودەکان - کتب متون الحديث -دا هاتووە، بەرچاویشم نەکەوتووە هیچ کەسێکی فەرموودەناسان - علماء

الحدیث - گومانی هەبێ لەوەی فەرموودەیەکی راستە، وێڕای ئەوەی پایەدارییەکی ناڕاستەوخۆ دەبەخشێتە ئەم چەمکی "مانەوە بە خودا"یە، خۆشەویستییەکەش دەکاتە دووسەرە، واتە نەك تەنها لە عاشق -مورید-ەوە بۆ مەعشووق -موراد-، بەڵکو لە خودی مەعشووقیشەوە بۆ عاشق. ئەمەش لە قورئانی پیرۆزدا پاڵپشتی گەورەی هەیە، وەکو: **قُلْ إِنْ كُنتم تحِبونَ الله فَاتبِعوني يحبِبكُم الله ويغفِر لكُم ذُنوبكُم والله غَفُور رحِيـم/ آل عمـران ٣١**، و **يا أيها الذِين آمنوا من يرتد مِنكُم عن دِينِه فَسوف يأتي ا ُ بِقَومٍ يحِبهم ويحِبونه أَذِلةٍ علَى الْمؤمِنين أَعِزةٍ علَـى الْكَافِرِيـن يجاهِدونَ فِي سبِيل ا ِ ولاَ يخافُونَ لَومةَ لائِمٍ ذَلِك فَضلُ ا ِ يؤتِيـهِ من يشاءُ وا ُ واسِع علِيم./ ا ائدة ٥٤** لە بەرانبەری ئەمەشدا "وقت - کات" حاڵە، و بە گشتی، کورتە و هێندێجار ئێجگار کورتە، بە تایبەت کە ئەو وەقتە "قبض - دڵگوشراوی" یان "بسط - دڵکراوەیی" یان "حزن - خەم" و "سرور - خۆشی" بێت. بۆیە پێدەچێ هەموو ئەوەی لە بەیتی پێشتر باسکراودا هاتووە، بە مژدەکەشەوە،: "وتی: ئاخر سبەینێ جەژنە خوێنی تۆ لە پێ دەگرم"، دەکرێ رەنگدانەوەی چرکە و جەزبەیەك بێت و زوو بەسەر چوو بێت. بە وردبوونەوەی تەواو لە شیعرەکانی مەحوی/ش، دەتوانرێ پەی بەو راستییە ببرێت کە زۆربەی ئەو بەیتانەی شاعیر، کە بە تەواوی کەف و کوڵی سۆزی صۆفییانەیان

پێـوە دیـارە و لـە ئـەزموونی صـۆفیگەرییەوە هـەڵقووڵاون، هـەر ڕەنگدانەوەی چرکەی خۆیانن و پێناچێ، لە ڕووی کاتـەوە هێنـدە پایەدار بن. هێندەی پەیوەندیی بەم مەسەلەیەوە هەیە، لە خودی ئەم غەزەلەدا، بە شێوەی ڕاسـتەوخۆ پـەی بـەو ناپایەدارییـە، لـە چوارەمین بەیتەوە، دەبرێت:

**لە ڕووسووریی عیبادەت لام و ڕووزەردی خەجاڵەت مام**
**بە نـاوی سـێوی ناوم، باغەوان، و من بەهـێ دەگـرم**

لێکدانەوەی ئەم بەیتە، لە چوارچێوە گشتییەکەیدا ئێجگـار ڕوونە، و لە خودی دیوانـی شاعیریـشدا هێڵـە سـەرەکییەکانی ئـەو لێکدانەوەیـە بـە جوانـی ڕەچـاو کـراوە، بـەڵام لـە بـواری وردەکارییەکاندا زۆر خاڵی گرنگ هەن پێویستیان بە یەکلاکردنەوە هەیە. زنجیرەی ئەو وردەکارییانەش لە بـە بـەراورد لەگـەڵ بەیتـی پێشوو، لە ئاراستەی ئەم بەیتەدا، لـەو خاڵـەوە دەسـت پێـدەکات کە پاش هەموو وردەکارییـەکانی بـەیتی پێـشوو ورووژێـنرا، واتـە: پایـەداری و ناپایـەداریی ئـەوەی دیـوی نـاوەوەی بەیتـەکان ڕایدەگەیەنن. لەو ڕووەوە ئەوەی لێرەدا بەدی دەکرێت پێچەوانەی ئەو مژدەیەیە کـە لـە بـەیتی پێـشوودا دەبیـنرێ، بـە ڕادەیەکیـش ئاڕاستەکە دەگۆڕێت کە شاعیر لە "مژدە پێـدراو"ەوە دەخرێتـەی خانـەی "کەمتەرخـەمان" و ناچـار دەبێـت بـەخۆدا بـچێتەوە. تەفسیری ئەمە بە یەکێك لەم دوو خاڵە دەکرێت:

١. پـەنا بردنەوەبـەر چـەمکی "یـەکێتی بـەیت – وحـدة البیت"، کـە یەکێکـە لـە کۆڵەکـەکانی تایبەتمەندییـەکانی شـیعری کلاسیکی و لە سەرەتای ئەم خوێندنەوەیەدا جەخت لەسـەر ئـەوە کرا کە غەزەلی (٤م) ناچێتەژێر ئەو چەترەوە. بـەم پـەنا بردنـەوە بەر ئەو چەمکە دەتوانرێ بگوتـرێ کـە ئـەم بەیتـە سـەربەخۆیە و پەیوەنـدیی بـە بـەیتی پێـشووەوە نییـە. ئەگەرچـی لـە شـیعری کلاسـیکیماندا، بەگـشتی، یـەکێتیی بـەیت رەچـاوکراوە، و هـەر بـەیتێك لـەو چوارچـێوەیەدا مـەرج نییـە، لـە رووی مـەعناوە، بـە بەیتەکانی دیکـەوە ببەسـترێتەوە، بـەڵام ئـەزموونی صـۆفیگەری، هێندەی پەیوەندیی بەم خوێندنەوەیەوە هەبێ، رێگە بـەوە نـادات مـــەقامێك، کـــە بـــە حیـــسابی ئەزموونەکـــە زۆر پێـــشکەوتووە، رابگەیەندرێت و پـاش ئـەوەش دەرکـەوێت کـە هێـشتا بنەماکانـی چـوونە نێـو ئەزموونەکـەش، بـەپێی پێویـست، نـاتوانرێ بـەدی بکرێن.

٢. پـــەنا بردنەبـــەر ئـــەوەی ئـــەو بەیتـــە تـــەنها زادەی هەڵچوونێکی سۆزئامێزی کورت و خێرا بێت، هەڵبەتە بـە مـەعنای سۆزی صۆفییانە، کە بروسکئاسا رووبدات و بەسەر بـچێت. بـەڵام لـە ناخـەوە هەژانـدبێتی و کـاری تـێ کردبووبـێ و بـەرەو ئاقـاری ئەوەی بردبوو بێ فریـو بـدرێت و وا بزانـێ درێژخایـەن، پایـەدار و رەسەنە. پاش ئەوەش، هەر کـە بـۆی دەرکـەوتووە وا نییـە، بـەو

شێوەیە ناچار بووە بە خۆیدا بچێتەوە. دیارە لێرەدا هیچ جۆرە لەخۆگۆڕان و خۆلێگۆڕین/ێکی سەلبی و نەویستراو: "تەلبیس" یان "تەبلیس" لە ئارادا نییە، چونکە لەو حاڵەتەدا خاوەن ئەزموون لە خشتە دەبردرێت، و بە هیچ جۆرێك بواری ئەوەی لە بەردەمدا ناهێڵرێتەوە کە بە خۆیدا بچێتەوە.

"**لە رووسووریی عیبادەت لام**"، سەرەڕای ئەوەی ئاشکرایە کە "لام" لێرەدا مەعنای "دوورم"، "تەریکم" یان "بێبەشم" دەبەخشێ، بەڵام بەکارهێنانی "لا" بە تەنێ، بەم مەعنایانەی لێرەدا ئاماژەیان بۆ کراوە، بەلای کەمەوە لە بەکارهێنانی ئاسایی و رۆژانەی زمانی کوردیدا، دەگمەنە. خودی مەحوی نموونەی دیکەی هەیە:

**لاڵە خۆ "مەحوی" لە وەصفی حوسنی بێچوونی نیگار**
**لا لە تەئویلی خەلەف، قوربانی تەئویلی سەلەف**

١ ف ٩ ل ١٧٦

بەڵام ئەمەی ئەم شاعیرەمان و هەر شاعیرێکی دیکەش هەیبێ، لە چوارچێوەی زمانی شیعری و پێویستییەکانی شیعردا دادەنرێن، و شیعر لە هەموو کۆت و پێوەندەکانی بەکارهێنانی رۆژانەی زمان رزگاریان دەکات. وشەی "عیبادەت"، بە ئاماژە بۆ ئایەتی ژمارە "٥٦" ی سوورەتی "الذاریات": **وما خلقْت الْجِنّ والْإنس إلّا ليعبدون** ، و بە رەچاوکردنی ئەو گێڕانەوەیەی

"مجاهد" کە مەبەست لە "**لیعبدون**" "**لیعرفونی**" [٤١]یە، ئەوا ئـەو وشـــەیە "خـوداناســـی" دەگەیـــەنێت. کەواتـــە کرۆکـــی "بەخۆداچـوونەوە" کـە بریتییـە لـە خـۆبینین و خۆدۆزینـەوە لـە "کات" و "بار"ێکدا کە رووسـووریی ئـەوجۆرە "خـوداناسـی"یـەی تێـدا بــەدی ناکرێــت، کــە گەوهــەر و شــێوەی راســتەقینەی "خوداپەرستی"یە، بەڵکو بە پێچەوانەوە بەو شێوەیە مایـەوە کـە "رووزەرد" ی "شەرمەزاری"یـە. دەشـزانرێ کـە "رووسـووری" و "رووزەردی" پێچەوانەی یەکن، بەڵام "خەجاڵەت - شـەرمەزاری" راستەوخۆ پێچەوانەی "عیبادەت - خوداپەرسـتی - خوداناسـی" نییە، دەرەنجامی پێچەوانەکەیەتی، کە دەکـری "خـودا نەناسـی" یــان "خودانەپەرســتی" بێــت، واتــە "رووســووری" راســتەوخۆ دراوەتەپاڵ هۆکارەکەیەوە، کە "عیبادەت"ە، بەڵام "رووزەردی" یەکــە دراوەتــەپاڵ دەرەنجــامی هۆکارەکــە، و بەمــەش شــاعیر مەبەست و دەرەنجامەکەی پتر چڕکردۆتەوە، و مەبدەئی کورتی و پوختیی داهێنەرانەتر رەچاو کردووە.

ئــەوەی پــاش بەرانبــەرکێ پێکردنــی ئــەم پێــچەوانانە دەمێنێتـەوە، هـەردوو فـەرمانی "لا" و "مـا"یـە، هەڵبەتـە پـاش دامـاڵینی "م"ی یەکـەمین کەسـی تـاك - قـسەکەر - لـە "لام" و "مــام". بەمــەش دەبــێ "لا" مــەعنای "نــەما" ببەخــشێت.. ئاشکراشە کە "نەما" لـە هـەموو وشـەکانی "تـەریك" و "دوور" و

"بێبــەش" و "سەرپێــچیکار - ملپێــچیکار"ەوە نزیکــە، بــەلاّم تایبەتمەندییەکیشی هەیە لە هەموو ئەو وشانەی جیادەکاتــەوە، و هــەمان تایبەتمەنــدی لــە "لا"شــدا بــەدی دەکــرێ. "لا"، کــە رەنگدانــەوەی تــەواوی لــە وشــە لێکـدراوەکانی وەکـو "لاکـەوە"، "لاچـۆ"، "لابـە" و.. تـاد، دا دەبینێتـەوە، لەگـەڵ "نـەما"، لـەو خاڵـەدا هاوبەشـن کـە ئەنجامـدانی بـە جووڵـە لـە حاڵتێکـەوە بـۆ حاڵەتێکی دیکە بەستراوەتەوە، ئەمەش لە بواری لێکدانەوەی ئەم بەیتەدا زۆر گرنگە. با لە "مـا"، "مـان" و "نـەما"، "نـەمان"ەوە دەست بکەین بە شیکردنەوەی پێویست.

ئەگەرچـی "مـان" و "نـەمان" زیـاتر مـەعنای "بـوون" و "نەبوون" دەبەخشن، بەلاّم بە دەسپێك - الانطلاق - لـەوەی کـە بە کردەوە ئەو بوونە سەلمێندرا بێت، واتە ئەوەی لـە فەلـسەفەی ئیسلامیدا بە "الوجـود بالقوة" یان "الوجـود بالفعـل" دەناسـرێ. "مان" بەردەوامیی ئەو "بوون"ەیە و "نەمان" کۆتـایی پێهـاتنی، بەلاّم "مانەوە" بەردەوامیبوونە لـە "شـوێن" یـان "حاڵـەت"ێکـی دیـاریکراودا: "هــەر لــەو گونــدەدا مایــەوە" و "تــا ئێــوارە بــە رووخۆشـی مایـەوە" و... تـاد، لـە هـەردوو حاڵەتیـشدا "مـان" و "مانەوە" ئاماژەن بۆ بەردەوامی ئەوەی کە هەبووە، کەچـی "لا" بە پێچەوانەی ئەمەوەیـە: "لاچـوون" جووڵەیـە لـەوەوە کـە هەیـە بــەرەو تــازە و خــودی وشــەی "لا"ش، بــە هــەموو ئــەو شــێوە

بەکارهێنانەی بە خەیاڵماندا دێت، لە سەنتەردا نییە.. چەق نییـە، تەنانەت ئەگەر بەشێکیش بێت لە شتێك ئەوا هەر دامێن و پەراوێـز و دیوی دەرەوەی ئەو شتەیە. "مـەحوی" چۆن مامەڵـەی لەگـەڵ ئەم "لا" و "ما"یەدا کردووە؟

روونە کە میتـۆدی شـاعیر "عیبـادەت - خواپەرستی" بـە ئەسڵ دەزانێت، و پاڵپـشتی ئەمـەش لـە چـەند دەقێکـی قورئانـی پیرۆزدا بەدی دەکرێت، کە یەکێکیان ئایەتی (الـذاریات ٥٦)ە، کـە پێـشتر لـەم خوێندنەوەیـەدا بـە بەڵگـە هێنراوەتـەوە، و چـەندین ئایەتی دیکەش هەن کە هەر لە لێکدانەوەی ئەم بەیتەدا ئاماژە بۆ هێندێکیان دەکرێ. لـە خـودی ئـەم بەیتەشـدا بەڵگـە ئەوەیـە کـە "رووسووری"ی داوەتەپاڵ وشەی "عیبادەت"ەوە، و لە دووەمـین بەشی ئەم بەیتەشدا ئەو خاڵە دووپات دەکاتەوە، ئەمـەش لـەوەدا دەبینرێ کە بۆ ئەوەی بلـێ بـاری مـن لـە شـوێنی ئاسـایی خۆیـدا نەماوە، وشەی "لا"ی لەگەڵ "رووسووریی عیبادەت بەکارهێناوە. ئەم بەکارهێنانەش بە تەواوی سروشتییە، ئەوەی جـۆرە هەسـتێك بـە نائاسـایی بـوون دەورووژێـنێ بـەکارهێنی "مـا"یـە لەگــەڵ "رووزەردی خەجاڵـەت"دا. ئەگـەر "مـا" بـەردەوامی حاڵەتێـك بگەیەنێ و "رووزەردیی خەجاڵەت" حاڵەتێکی وەدەستهاتوو بێت، چۆن دەکرێ "ما"ی بۆ بەکاربهێنرێ؟

پێموایە شاعیر، لەلایەکەوە زۆر زیرەکانە هەوڵیداوە، بەشێوەش، نەك تەنها بە ناوەڕۆك، بمانخاتە قووڵایی جیهانی "نائاسایی"یەوە، و لە لایەکی دیکەشەوە ئاستی گەورەی ئەو گۆڕانەی خستۆتەڕوو. واتە کە دەڵێ: "رووزەردی خەجاڵەت مام"، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە ئەو "روو زەردیی خەجاڵەت"ە تازە نییە، بەڵکو هێندە کاتی بەسەر چووە و هێندەش رەگی قووڵبۆتەوە کە ئەمەی باس دەکرێ "مان"ە، –مانەوە–یە لەسەر ئەو حاڵەتەی کە ئیدی لە حاڵەتێکی لەپڕ دەرکەوتوو – طارئ – دەرچووە و بۆتە "خوو – عادەت"، و ئیدی ناکرێ بە تازە داهاتوو و ناپایەدار دابنرێ. هەر بەم پێوەرەش "ئاسایی" و "ناسایی" و "ئەسڵی" و "نا ئەسڵی" جێی یەکدییان گرتووە، و چیدی، لەو حاڵەتەی شاعیر باسی لێوە دەکات، ناتوانرێ باس لە "رووسووریی عیبادەت" لە شێوەی واقیعێکی راستەقینەدا بکرێ، چونکە تازە لەنێو چووە. حاڵی جێگیری شاعیر – کە لێرەدا نابێ بە عاشق ناو ببرێ – ئەوەیە کە لە چەقی "رووسووریی عیبادەت"دا خۆی نابینێتەوە، بەڵکو بە تەواوی لەو چەقە "لا"یە – دوورە – تەریکە – بێبەشە –.

ئایا مەحوی، لەم بەیتەدا تەنها ئاماژەی بۆ ئایەتی (٥٦ الذاریات) کردووە یان، لە پەناوە، ئایەتی دیکەشی مەبەستە!؟.

لە یەکەمین بەشی بەیتەکەدا وشەی "عیبادەت" بە روونی و راشکاوی باسکراوە، بەو شێوەیەی کە شاعیر لە بەرهەمی راستەوخۆی ئەو "عیبادەت"ە، یان لە رواڵەتی، کە "رووسووری"یە، بێبەش و دوورە. لە بەرانبەری ئەمە، و لە دووەمین بەشدا ئەو "رووسووری"یە، بەرواڵەت بەهۆی رەنگەکەوە، بە "سێو" شوبهێندراوە، بەلاّم ئەرکی ئەم دووەمین بەشە لە سنووری "لێچواندن - شوبهاندن"دا کۆتایی پێنایەت و راناوەستیّ، بەڵکو دوو خاڵی ئێجگار گرنگی دیکەش دەسەلمێنیّ:

یەکەم: کە دەڵیّ "**بە ناوی سێوی ناوم باغەوان**" بیّ پەردە باس لەوە دەکات کە باغەوان "سەرچاوەی بوون - ئافەریدەکار - داهێنەر" بڕیاری وا بووە من "سێو" بم. بە گەڕانەوە بۆ "رووسووریی عیبادەت"، لە یەکەمین بەشی ئەو بەیتەدا، هەر بۆ ئەوەمان پاڵ پێوەدەنیّ کە بڵێین مەحوی لێرەدا جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە "خودا - باغەوان" ناوی ئەوەی لێناوە -لە هەموو بوونەوەرە تایبەتەکانیش-کە "سێو" بن - رووسووریی عیبادەت وەدەست بێنن -، کەواتە جێی خۆیەتی یەکێك لە ئاماژەکانی ئەم بەیتە ئایەتی **وما خلقْت الجِنّ والْإنس إلّا لِيعبدون الذاريات ٥٦** بێت، بە لێکدانەوەکەی موجاهید/یشەوە ، کە مەبەست "لیعرفونی - تا بمناسن"ە، بەلاّم ئەمە هەموو ئاماژەکان نییە وئەم شوێنە پێویستی بە هەڵوەستەی زیاتر هەیە.

دووەم: بە دووپاتکردنەوەی "من بەهێ دەگرم" راستەوخۆ دوابەدوای "بە ناوی سێوی ناوم باغەوان"، کەمترین شت کە دەتوانرێ لەوەوە هەڵێنجرێ جیاوازی - بەڵکو هاودژی -ی ئەنجامە لەگەڵ ئەوەی بە روونی "باغەوان" بڕیاری لێ دابوو. بەڵام ئەوەی بەرپرسی ئەو جیاوازی و هاودژییەیە یەکەمین کەسی تاکە: "من - قسەکەر"، واتە: شاعیرە: "من بەهێ دەگرم"، واتە: "کردەوەی من پێچەوانەی ویستی باغەوانە". ئەمەش هەر هەڵوەستەی دیکەی دەوێ.

سەبارەت بەو ئاماژەیەی یەکەمین خاڵ بە روونی درکاندی دەتوانرێ پەنجە بۆ دەیان ئاماژە درێژ بکرێ، بەڵام هێندەی پەیوەندیی بە ئەزموونی صۆفیگەرییەوە هەیە ناتوانرێ تەنها ئەو قەرینەیانە رەچاو بکرێن کە رەنگە راستەوخۆ ئاماژەی ئایەتی (الذاریات ٥٦)مان بەسەردا دەسەپێنن. بە گەڕانەوە بۆ میتۆدی ئەو ئەزموونە سێ مەسەلەی سەرەکی بەدی دەکرێن کە بایەخی ئێجگار گەورەیان هەیە:

أ. بوونی جۆرە گرێبەستێکی بناغەیی، کە بەلای صۆفییانەوە ئەزەلییە، لە نێوان عاشق و مەعشووقدا، بەڵکو لە نێوان خالیق و مەخلووقدا، کە پێش هەموو شتێك دەکرێ ناوی "پابەندیی ئەزەلیی مرۆڤ"ی لێبنرێ. ئەو پابەندییە لەم ئایەتە پیرۆزەوە شەرعییەتی خۆی وەردەگرێ: **وإذْ أخذَ ربك مِن بني**

**آدم مِن ظُهورِهم ذُريتهم وأشهدهم على أنفُسِهم ألست بِربكُم قالُوا بلى شهدنا أنْ تقُولُوا يوم الْقِيامةِ إِنا كُنا عن هذا غَافِلِ / الأعـراف ١٧٢** . شـاعیرانی صـۆفی، بـە چـەندین جـۆر تـەعبیریان لەمـە کـردووە: "رۆژی ألـست"، "جـامی ألـست"، "قـالوا بلـی - قالـو بـەلا"، "رۆژی ئـەزەل" و... تـاد. پێناچـێ لـە نێـو شـیعرەکانی مەحویدا، بە تایبەت غەزەلەکانی، بتوانرێ ئاماژەی راستەوخۆ، بە ناو هێنانی "ئەلەست - ألست" یان "قالوا بلی - قالو بەلا" بەدی بکـرێ، ئەگەرچـی دەیـان بـەیت هـەن ئامـاژە بـۆ ئـەو پابەندییـە دەکــەن، بــەڵام شــاعیرێکی کــۆنتر و هاوتەریقــەتی مــەحوی: (نەقـشبەندی)، کـە "مەولـەوی"یـە، بـە چـەندین شـێوە ئامـاژەی راستەوخۆ هەیە، وەکو:

١.أ. ئامــاژە بــۆ ســــەودا -مامەڵــە -ی ئــەزەلی کــە لــەو ئایەتــەدا هەیــە، واتــە پەیماننامەکـەی، و باسـکردنی راسـتەوخۆی "بازاڕی شاری ئەلەست":

**من رۆی مامەڵـــەی گـــردین خاس و کـــەس**
**جـــەو راســـە بازاڕ شـــارەکەی ئـەلەس**

**جـە ســەر دوکانچـەی شــای ســەر توجــاران**
**هـۆر گرتـم کالأی بەلأی نــــازاران**[٤٢]

٣ چ ٨ و ٩ ل ١٩٢

٢.أ. دانانی بە " بەزم "، کە بە پێی هـەموو پێکهاتـەکانی: "خواجـە"، "حەلقـە"، "بـەزم"، "نەشـئە"، "فـەنا"، "بـادە"، "مەسـت"، مەبەسـت لـەو وشـەیە "بـەزم" هـەر ئەزموونـی صـۆفیگەری و ڕێوڕەسمـەکانێتی، و بـە قەرینـەی بـەیتی پێـش ئەوەش کە زاراوەکانی "زەوق" و "شەوق"ی تێدا بـەکارهێنراوە، واتە: "ڕێبازی عیشق"، ئەمەش هەردوو بەیتەکەیە:

**دەس و دیـــم وە ئـاو روکـــن ئابـــاد شـەوق**
**ئیمــــام میحـراب ســــــەر " مُصـلاّ " ی زەوق**

**خواجـەی سـەر حەڵقـەی بەزمەکەی " ألسـت "**
**دەمـاخ وە نەشـئەی بادەی فەنـــا مەســـــت**

٢ ر ٢ و ٣ ل ٢٧٤

٣. أ. دانانی بە قوتابخانەیەك کە هەردوو پرۆسەی "سـزا" و "فێرکـردن"ی تێـدا بـە گـەرمی بـەدی دەکـرێ، ئەمـەش وێـڕای ئـەوەی ئامـاژە بـۆ لایـەنی "ئەپـستمۆلۆژی - تیۆریـی زانـین" و "ئیتیـك - ئـەخلاق - ئاکـار"ی بـواری صۆفیگەریـشی تێـدا چڕکردۆتەوە:

**مامۆســـتای شـیرین، شـۆخ و دیـــدە مەسـت**
**جە مەکتـەبخـانەی مەدرەســـــەی " ألسـت "**

**دیـــــدەش مەکتـــــەبی قـەدەر ســــــــــزا دا**
**نیـم نیگاش تالیــــــم تفـــــلْ قـــــــەزا دا**

١٠ م ١ و ٢ ل ٤٠٨

لە دەرەوەی شیعری کوردیشدا بایەخی ئێجگار گەورە بەو پەیماننامەیە دراوە، و شاعیرێکی گەورەی وەکو "حافظی شیرازی" راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ دێتەسەر باسی، و لە هەردوو حاڵتیشدا هەر بە "عیشق"لێکی دەداتەوە. کە راستەوخۆ باسی ئەو پەیماننامەیە دەکات لە روانگەی "دەرکەوتن - تەجەللی"یەوە لێیدەڕوانێ و دەڵێ:

**در ازل پرتو حسنت ز تجلی دم زد**
**عشق پیدا شد وآتش بهمه عالم زد**

کە ناڕاستەوخۆش باسی دەکات جوانیی حەزرەتی یوسف (د.خ) دەکاتە نموونەیەکی ئەو بڕیارە ئەزەلییەی عیشقی هێنایەئاراوە:

**من از آن حسن روز افزون کە یوسف داشت دانستم**
**کە عشـــق از پردە عصمـت بـرون آرد زلیخــــارا**(٤٣)

پێش ئـەویش شـاعیری صـۆفیی گـەورەی ئێـران (سـەعدی شـیرازی)، کـە لـە نێـو زانایـانی ئـایینی کوردسـتانی خـوارووداگەورەترین ناوبانگی هەبووە، لە چەندین شـــوێندا، راسـتەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، باســـی ئەو بڕیـارە ئەزەلییەی کـردووە. جیاوازیـی "سەعدی" لە "حافـظ" لـە بـواری خـستنەڕووی وردەکارییەکانـی صۆفیـــگەریدا لەوەدایـــە کـــە پـــتر رەنگدانـــەوەی ئەزموونـــی صۆفیگەرییەکەی تێدا بەدی دەکرێـت، ئەگەرچـی ئاسـتی شـیعری حافز بەرزترە. لە باسی راستەوخۆی ئەو بڕیارەدا، سەعدی دەڵێ:

**اگر طالبی کاین زمیـن طی کنی نخست اسب باز آمدن پی کنی**
**تأمل در آیینـــەء دل کنـــــی صفایی بتدریـج حاصل کنی**
**مگر بویی از عشـق مسـتت کند طلبـکار عهد أَلسـتت کند**[٤٤]

لە باسی ناڕاستەوخۆشدا دەڵێ:

**همه عمر برندارم سر از این خمار مستی**
**" که هنوز من نبودم که تو در دلم نشستی"**[٤٥]

ب. بوونی جۆرە پابەندییەکی تایبەت بە مرۆڤـ، کە ئێجگـار سەختە و زەوی ئاسمان و چیاکان نەچـوونەتە ژێـر باریـەوە. ئـەم

پابەندییە، لە قورئانی پیرۆزدا، بە "ئەمانەت" ناوبراوە: **إنّا عرضنا الأمانةَ على السّماواتِ والأرض والجِبال فأبين أنْ يحمِلْنها وأشفَقْن مِنها وحملها الإنسانُ إنّه كانَ ظلُوما جهولاً / الاحزاب ٧٢** ، لە بواری صۆفیگەریدا چەندین مەعنای جیاواز بۆ ئەمانەت خراوەتەڕوو، لەوانە خواپەرستی و ملکەچی بۆ خوا و قورئان و... تاد، بەڵام ئەوەی زایەڵەی بەرچاوی هەیە ئەوەیە کە "خواجە عەبدوڵڵای ئەنصاری دەڵێ": مەبەست لە وشەی "ئەمانەت"ی ئایەتی ئایەتی **إنّا عرضنا الأمانةَ على السّماواتِ والأرض والجِبال فأبين أنْ يحمِلْنها وأشفَقْن مِنها وحملها الإنسانُ إنّه كانَ ظلُوما جهولًا / الأحزاب ٧٢** ، خۆشەویستی و عیشقە ". بە پێچەوانەی ئەوەی سەبارەت بە ئاماژە بۆ ئایەتی (الاعراف ١٧٢) دا بەدیمان کرد، "مەحوی"، هەر بەم مەعنایەی لە لێکدانەوەکەی ئەنساری/دا دەبینرێ، زۆر بە روونی ئیشارەتی بۆ ئەم ئایەتە کردووە:

**خوداگرتوو دڵم چۆتن بە گژ شۆڕ و شەڕی عیشــقا**
**بە نەصصی ئایە ئەفلاك و زەمین ئەم بارە ناکێشێ**

٥ ی ٦ ل ٣٠٤

ج. لای صۆفییان، بێجگە ئایەتی (الذاریات ٥٦) کە پێشتر چەند جارێك ئاماژەی بۆ کراوە، ئایەت و فەرموودەی دیکەش هەن ئاماژە بۆ ئەو سروشتە تایبەتییە دەکەن کە مرۆڤی لەسەر

دروستکراوە و ئەو کاریگەرییانەی ئەو سروشتە دەگۆڕن، لەوانەش ئایەتی: **فَأَقِم وجهك لِلدِّين حنِيفًا فِطْرت اللَّهِ الَّتِي فَطَـر النَّـاس عليها لا تبدِيلَ لِخلْق اللَّهِ ذلِك الدِّين الْقِيِّم ولكِنَّ أكْثَـر النَّـاس لا يعلمونَ / الروم ٣٠** ، کە سەرچاوەی چەمکی "فطرة"[٤٦]یە، و چەندین فەرموودەش کە لە هەمان خولگەدا دەسووڕێنەوە، وەکو: "هەموو لەدایکبوویەك لەسەر سروشتی بوونی - کە ئیسلامە - لەدایك دەبێت، بەڵام دایك و باوکی یان بە جوولەکەی دەکەن، یان بە دیان - مەسیحی - یان بە مەجووسیی دەکەن"[٤٧]، و "من بەندەکانم هەموو بە حەنیفی[٤٨]دروست کرد و شەیتانەکان هاتن بۆیان و لە دینەکەیان دووریانخستنەوە"[٤٩].

ئەو پابەندییانەی ئاماژەیان بۆ کرا، بەپێی دەقی ئایەتە بە بەڵگە هێنراوەکان، مرۆڤ خۆبەخشانە هەڵیبژاردوون، و ئەمەش دەیانکاتە گرێبەست - عقد -، گرێبەستیش، بەپێی ڕێسای باو، یاسای ئەو کەس و لایەنانەیە کە پەسەند و مۆریان کردووە.

سەبارەت بەو دەرەنجامەش کە لە لێکدانەوەی "من بەهێ دەگرم"دا پێیگەیشتین، واتە جیاوازیی بەروبووم: "بەهێ" لەوەی باخەوان ناوی "سێو"ی لێنابوو، بەو پێیەی یەکەمین کەسی تاك - قسەکەر- بەو مەبەستە بەخۆداچوونەوەی بە پێویست دەزانێ کە "کردەوە"ی بە پێچەوانەی ویستی "باغەوان"ە.. ئایا بەو مەعنایەیە کە مرۆڤ خوڵقێنەری کردەوەکانی خۆیەتی!؟

ئەگەر ئەو بۆچوونە پەسەند بکەین ئەوا دەبێ پێمانوابێ کە "مەحوی" یەکێك لـە بنـەما سـەرەکییەکانی بیروبـاوەڕی گرووپـی موعتەزیلە - گۆشەگرتووان -، کە پـەیڕەوییان لـە بۆچـوونەکانی (واصلی کوڕی عەطا) دەکرد، دووبارە دەکاتـەوە، ئەمـەش راسـت نییە، چونکە "مەحوی" لـە قەسـیدەی عقـد العقائـد - ملوانکـەی باوەڕ"دا، نەك تـەنها خـوا بـە خوڵقێنـەر بڕیـاردەری کردەوەکانـی بەندەکانی دەزانێ، بەڵکو راشـکاوانە بیروبۆچـوونی "موعتەزیلـە" بە جۆرە توندڕەوییەك لە قەڵـەم دەدات، و لەگـەڵ جەبرییەکانـدا، کە لەم رووەوە بۆچوونیان پێچەوانەی بۆچوونی موعتەزیلەیـە، لـە دووتای هـەمان تـەرازووی رەتکردنـەوەدا جێگیریـان دەکـات و بـە یەکسانیان دەزانێـت، ئەگەرچـی لـەو مەسـەلەیەدا دژە ئاڕاسـتەی یەکن:

**بۆ عەبــد و بۆ عەمەلیـەتی خوڵقندە ئـەو، ئەوە**
**تەوفیقی دا بە ئێمە و خەذلانی دا بەوان**

**خالیق یەکێکە، کاسیبە عەبد، ئەم پەڕ ئەوپەڕە**
**ئیفراطی ئیعتیـزالی یو تەفریطی جەبرییان**

عقد العقائد ٢١ و ٢٢ ل ٣٧٣

ئەوەی "موعتەزیلە" بە "ئازادیی بەندە - حریة العبد"ی دەزانیێ، بە پاساوی ئەوەی بیکاتە بەرپرسیاری کارەکان - کردەوە -ی خۆی و سەلماندنی "دادپەروەریی خودا" لەو ڕێگەیەوە، بەلای "مەحوی"ییەوە توندڕەوییە لەبەرئەوەی جۆرێکە لە جۆرەکانی کەمکردنەوەی "ویست"، بۆیە لە ڕێگەی نیازی بەندەوە کێشەکە چارەسەر دەکات.. واتە ئەوەی بەندە ئارەزووی لێیەتی خودا بۆی دەکات، بەمەش بەندە بەرپرسیارە لەوەی کردوویەتی چونکە نیاز و ویست و ئارەزووی خۆی بووە. ئا لێرەوە کردەوەی بەندە - عەبد - خۆی دەبێتە پێچەوانە و دژە ئاڕاستەی پابەندییەکانی خۆی، ئەوەش پەیمان شکێنییە، بۆیە تەنها خۆی بەرپرسیارە لە کردەوەکانی، بەلاّم ئەمە ناگاتە ئەو ئاستەی بگوترێ بەندە - عبد - خولّقێنەری کردەوەکانی خۆیەتی.

دەرەنجام، لێکدانەوەی سەرجەمی بەیتەکە، بەپێی میتۆدی صۆفییانە، بەم شێوەیە دەبێ: باخەوانی ئەزەلی، کە خودایە، لە ئەزەلەوە بۆ مەبەستێکی بەرز منی دروست کردووە کە "خوداپەرستی- خوداناسی"یە، و ئەمەش تەنها قسەیەك نەبووە، بەڵکو گرێبەستێك بووە خۆم پەسەندم کردووە و چارەنووسمی پێداڕێژراوە. هەر لەو ڕوانگەیەشەوە خۆم خستۆتەژێر قورسایی باری ئەرکێکی گەورەوە کە ئاسمان و زەوی

و چـیاکان ئامـادە نـەبوون هـەڵیبگرن، ئـەو بـارەش عیـشق - خۆشەویستی- بوو... عیشقێك کە دەبوو لە سـایەیدا دڵـی عاشـق بەو رادەیە بۆ مەعشووق تەرخان بکرایە کە تەنها جێی ئەوی تێـدا بـەدی بکـرێ. ئـا ئـەوە بـە تـەنێ دەتوانـرێ نـاوی "رووسـووریی خوداپەرستی - خوداناسی"ی لێبنرێ. بەڵام دڵی من لە ئەو غافڵ - بێ ئاگا - بوو و بە تەواوی کەوتە داوی دنیاوە. ئەو بێ ئاگایـی - غافـڵ بـوون -ەش وا ئێـستا تـەنها رووزەردی کـردووم و شەرمەزاریی بۆ هێشتوومەتەوە. مەحوی لە شوێنی دیکەشـدا، بـە شـێوەیەکی هونەرمەندانـەی روونـتر، بـاس لـە هـەمان ئـەم "شەرمەزاریی بێ ئاگایی"یە دەکات:

**دڵە عەرشی خودا "مەحوی" خەجاڵەت بە لەبەر غەفڵەت**
**کە بۆتە بوتکـەدەی بێ بەرهەمەن یا دەیری بێ راهیب**

٥ ب ٧ ل ٥٥

ئەم بێ ئاگاییەش هێندە مایەوە، پێشئەوەی بە ئاگا بێـم و بتوانم ئاورێك لە خۆم بدەمەوە و بەخۆدا بچمەوە کە بـووە خـوو و بـووە بەشـێکی جێگـیری کەسـایەتیم... ئـا ئەمـەش مایـەی ئـەو شـەرمەزارییە گەورەیـەی منـە، شـەرمەزاریی ئـەوەی نابەجـێ رەفتارم کرد، و لە ئـەنجامی ئەمەشـدا نابـەجێ مـاوم بـەو پێیـەی خیانەتم لە مانا و مەبەستی راستەقینەی بوونی خۆم کرد.

ئەمە رەنگرێژییەکی گشتیی ئەو هەلومەرجە تایبەتییەیە کە نەك تەنها شاعیر خۆی لە گێژاوی هەرەشەی خنکاندا دیوەتەوە، بەڵکو ترسی ئەوەشی خستۆتە دڵیەوە کە چیدی تەمەن و هیممەتیش - لە سایەی ئەو شەرمەزارییە ترسناکەدا - رێگەی ئەوە نەدەن کە بەخۆداچوونەوە فریای بکەوێت، ئەگەرچی ئەزموونی صۆفیگەری هەمیشە رەحمەت و لوتفی خوا لەوە گەورەترە کە مورید ختوورەی بێوەری - نائومێدی - بخاتە دڵی خۆیەوە. ئەم کاتەی شاعیر باسی لێوە دەکات کاتی بەخۆداچوونەوەی پاش بەفێڕۆدانی تەمەنێکی دوور و درێژی پڕ لە کاتی بەنرخ بووە، لە دووتوێی ئەو تەمەنە بەفێڕۆدراوەدا هاوڕاز و هاودەم و یاران لە گەشت - سەفەر -ی رۆحیی خۆیان بەردەوام بوون و ئەمیان بەجێهێشت. "مەحوی" لە شوێنی دیکەشدا ئاوڕی لەم "بەجێمان" و " نابەجێمان"ەی خۆی داوەتەوە:

**بەجیٚ ماوم لە یاران، نابەجیٚ ماوم، ئەجەل زوو بە**
**بە مردن لەم قوصووری ژینە ئیستیعفا نەکەم، چبکەم !؟**

١٠ م ٩ ل ٢٣٣

دەکرێ ئەم بەیتە شێوە لەخۆپرسینەوە -محاسبة النفس-ێك لە قەڵەم بدرێت. ئەمەش دەرەنجامی بەخۆداچوونەوە و چاودێریی خۆکردن - المراقبة -یە. لە عورفی ئەزموونی

صۆفیگەریدا ئەم مەسەلەیە بایەخێکی ئێجگار گەورەی هەیە، و دەبێ صۆفی لە هەموو کاتێکیدا ئاگای لەو لایەنە زۆر گرنگە بێت کە پێیدەگوترێ "سەودا - مامەڵە - المعاملات" و لە بواری "مافەکانی خوا بەسەر بەندەوە"[٥٠] دایە. لە پرۆسەی ئەو چاودێریکردنەدا صۆفی گلەیی لە خۆی دەکات لەسەر بە هەدەردان و ونکردنی هەناسە - انفاس - و کات - اوقات -ەکانی لە شتی دیکەی بەدەر لە لە ئەرکەکانی خواپەرستی. جێی گوتنە کە ئەم چاودێرییە، بە هەموو شێواز و پلەکانیەوە، پرۆسەیەکی ئیجابی و زۆر پێویستە و بریتییە لە بەجێهێنانی مافەکانی خوا بە دڵسۆزی و بە باشترین شێوەی شیاو، چ ئاشکرا بێت و چ نهێنی، کەچی لێپرسینەوە بەروبوومی ئەم چاودێرییە و دەرەنجامی بینینی کەموکوڕییە.

لە رووی شێوەوە، لێچواندنی "رووسوورِیی عیبادەت" بە "سێو" و "رووزەردیی خەجاڵەت - شەرمەزاری" بە "بەهێ"، تەنها پەیوەندیی بە رەنگەکان "سوور و زەرد"ەوە نییە، بەڵکو چەندین رووی هەیە، و بەم شێوەیە:

١. لە رووی رەنگەوە، بە دەلالەتی دەروونیی ئیحای رەنگی سوور، کە دەمارە چالاکەکانی ژیانی تێدا بەدی دەکرێت، و وێڕای گەرمیشی، لە بەرانبەر رەنگی زەردا، کە بە قەرینەی زەرد هەڵگەڕانی گەڵای پاییز پێش هەڵوەرینیان و ساردیی خودی

ڕەنگەکـەش، ڕەنگدانـەوەی ئیحـا - سـرووش - ە تایبەتەکانـی "رووســـووریی عیبـــادەت" و "ڕووزەردیـــی خەجاڵـــەت"ن. لـــە ئـــەزموونی صـــۆفیگەریدا یەکـــەمیان دەرگـــا گـــەورە و بەرینەکانـــی پێـشکەوتن و گەشەسـەندنی ئەزموونەکـەی بـە ڕوودا کراوەیـە، و سەرەڕای بڕینی قۆناغی گرنگیش، هەر دەتوانـرێ بـە "لاو بـوون" باسی خاوەنەکەی بکرێ. بەڵام ئەو دەرگایانەی بە ڕوودا داخراو - یان نیمچە داخراو-ە، و لە ڕوانگەی ئەزموونەوە، ئەگـەر لـە کاتـی گونجاودا فریای خۆی نەکەوێت و مەردانە قۆڵی کارکردنی جیددیی لێ هەڵنەماڵێ، ئەوا بە دڵنیاییەوە ڕوو لە ژاکان و فەوتانە و پیریـی ئەزموونەکەشە. مەحوی دەڵێ:

**پـیری نوفـووذی کـردە بـەدەن، بەسـیە تەنبـەڵی دەرچـۆ لـە خانووێ کە خەلەل کەوتە تەنبەلی**

٧ ی ١ ل ٣٠٦

بەڵام، سەرەڕای هـەر شـتێك و هـەر پلەیـەکی ئـەو "پیریـی ئەزموون"ە، هەمیشە لـە صـۆفیگەریدا دەرگـای بەخۆداچـوونەوە کراوەیە، و شاعیریش ئەم ئەگەرە دەخاتەڕوو.

٢. لە ڕووی شێوەی ئەندازەییەوە "سێو" شێوەیەکی ڕێك و جوان و گونجاوی هەیە، کە تەنانەت لـە دەسـتلێدان - لمس- یـشدا هەسـتێکی جوانـی هـەڵقوولاو لـە لووسـی و نـەرمی و

ڕێکوپێکی و گونجاوی لەگەڵ ڕووبەری لەپی دەست و نەبوونی بەربەستی نەویستراوی دەروونی بە مرۆڤ دەبەخشێ، کە لە بەرانبەردا "بەهێ" شێوەیەکی ئەندازەیی هێندە ڕێك و گونجاوی نییە، و دیوی دەرەوەیشی گەورەترە لەوەی لەپی دەستی ئاسایی بتوانێ، بە بێ هەستێکی دەروونی نەشاز، بەخۆوەی بگرێت و بە ئاسانی لەنێو لەپدا جموجووڵی کۆنترۆڵ بکات.

٣. لە ڕووی تامیشەوە، بەلای کەمەوە، سێو تامێکی نزیکتر لە چێژی گشتیی پەسەندی خەڵك هەیە، تورت نییە، نەرمە، ماوەیەکی زیاتر دەمێنێتەوە و لە بازاڕدا دەست دەکەوێ، و پتر خەڵکیش ئارەزوویان لێیەتی و بۆ خواردنی ڕاستەوخۆ بەکاری دەهێنن، کەچی بەهێ تورتە، پاییزێکی درەنگ پێدەگا، کەمتر دەتوانرێ ڕاستەوخۆ بخورێ.. واتە یان پاش پیشاندن دەخورێ، یان لە ڕێگەی کردنی بە مورەبباوە، چونکە زۆر ڕەقە، و سەرەڕای کەمیی ماوەی بوونی لە بازاڕدا، بازاڕێکی هێندە گەرمیشی نییە.

ڕەنگە شاعیر بیری لەم شتانە نەکردبێتەوە، ئەمە گرنگ نییە، ئەوەش گرنگ نییە کە ئەمڕۆ سێوی سوور و زەرد و سەوزی گەییو هەیە و دووریش نییە ڕەنگی دیکەشی هەبێ، بەلام لە لایەکەوە تا ئێستاش هەر سێوی سوور بەناوبانگترە، و شاعیریش هەر بەو تایبەتمەندییە بەکاریهێناوە، لە لایەکی دیکەشەوە سەرکەوتنی دەقی داهێنەرانە لە هەموو ئەو توانا هەمەلایەنە و

جۆربەجۆرانەدایە کە بۆ چەندین خوێندنـەوەی جیاجیـا و دوور لـە یەك دەیانڕەخسێنێ.

پێنجەمین بەیتی ئـەم غەزەلـە پـتر لـە راپۆرتێکـی ئاسـایی شـاعیر دەچـێ لـەبارەی خـودی عیـشق - مەحەببـەت -ەوە، ئەگەرچی چەند ئەگەرێکی خوێندنەوە لە ئارادایـە (کـە ئەوپـەڕیان هەر چوار ئەگەرە):

**لەسەرخۆچوونە، شەیدا بوونە، قوڕ پێوانە، سووتانە**
**هەتا مردن، مەحــەببەت ئیشی زۆرە، ریزی لێ دەگرم**

ئەگـەرەکانیش بـە دوو جـۆر خوێندنـەوەی هـەردوو وشـەی "ئیشی" و "ریزی"ی دووەمـین بەشـی ئـەم بەیتـە دێنـەئاراوە... واتە بە "ئێـشی" و "رێـزی"ش، کـە سـەرلەبەریان دەکاتـە چـوار ئەگەر، و لێکدانەوەکانیان بەم شێوەیە دەبن:

١. **"هەتا مردن مەحەببەت ئیشی زۆرە ریـزی لێ دەگـرم"**، واتە: ئەو ئەرکانەی خودی خۆشەویستی، بەو پێیەی گرێبەستێکی تایبەتی عاشق و مەعشووقە، کە ئێجگار زۆرن و مەعـشووق پەیتـا پەیتا دەیانخاتە ئەستۆی عاشقەوە، کـە منـم، منیـش لـە پێنـاوی ئەوەدا کە لە ئاسـتی ئـەو پـەیمان و پابەندییـە ئەزەلییـەدا بم کـە

رامگەیاندووە، تا كۆتایی بە ژیانم دێت، بە ریزە، یەك بە یەكی ئەو ئەركانە بە ئەنجام دەگەیەنم.

٢. **"هەتا مردن مەحەببەت ئیشی زۆرە رێزی لێ دەگـرم "**، واتە: ئەو ئەركانەی خۆشەویستی "عیشقی حـەقیقی" رووبـەڕووی منیان دەكاتەوە، هەر لەبەرئەوەی خۆشەویستییەكە گرێبەستێكی ئەزەلییە و بە وشەی بەڵێ: "قالوا بلی" بۆ خـۆم هەڵمبـژاردووە و مـۆرم كـردووە، بـە پیرۆزیـان دەزانم و بـە رێـزی تـەواوەوە رووبـەڕوویان دەبمـەوە. ئـەو رێـزە، لەلایـەن منـەوە، لـە شـێوەی ملكەچیی خۆی دەنوێنێ. ئـەو ملكەچییەش بـوار بـە هیـچ جـۆرە خۆشەویـستییەكی دیكـە ناهێڵێتـەوە، و هـەر كەسـێكیش، یـان تەنانەت هەر شتێكیش، ببێتە بەربەست لەبـەردەم خۆشەویـستیی مەعـشووقدا، دەبـێ عاشـق، بـە مـەنتیقی رێـزی راسـتەقینە لـە ئەركەكانی خۆی، دەست لەو كەسە، یان ئەو شتە، هەڵبگرێ:

**لەسەر تۆم دوشـمنە دنیا، قەضییـە م " مانع الجمع " ە**
**كە تەركی تۆ نەكـەم، تەركی هەموو دنیا نەكەم، چبكەم**
١٠ م ٧ ل ٢٣٢

٣. **"هەتا مردن مەحەببەت ئێشی زۆرە ریـزی لێ دەگـرم"**، واتــە: بــە پێـچەوانەی ئــەوەی مـرۆڤ لــە "عیـشقی مــەجازی"دا

چاوەڕوانیەتی، لە "عیشقی حەقیقی"دا ئێش و ئازار و ماندوویی، بە بەردەوامی، ڕوودەکەنە عاشق و ئەویش، نەك هەر لێیان بێزار نییە، بەڵکو خۆبەخشانە و بە گەرمییەوە بە دوایاندا دەگەڕێ:

**بە نۆشی جانی وەردەگرم پیاڵەی زەهری هەر نێشێ**
**بە دەردی دڵ بچم گەر بێ لە جەوری تۆ دڵم بێشێ**

٥ ی ١ ل ٣٠٢

هێندەش بە دوای ئەو ئێش و دەرد و داغەدا دەگەڕێ، کە بە هۆکار ئامراز و کەرەستەی پێوستی ژیان و گوزەرانی دەزانێت و ریز لە یەك بە یەکی ئەو ئێشانە دەگرێت، و هەتا مردن هەموو جۆرەکانیشی تاقی دەکاتەوە:

**دڵ بژێویی هەر بە دەرد و داغە، تەزییدی دەوێ**
**قەت مەکە مەنعی، دوعاگۆ سەعیە بۆ ضە ممی مەعاش**

١ ش ٤ ل ١٥١

٤. **"هەتا مردن مەحەببەت ئێشی زۆرە رێزی لێ دەگرم"**، واتە: ئەو خۆشەویستییەی هەتا مردن هەر ئێش و دەرد داخی زۆر و بەردەوامە، رێزی دەگرم، و نەك هەر بە شایانی ئەوەی دەزانم ببێتە مایەی ئەو ئەزموونەی هەموو ژیانمی بۆ تەرخان بکەم،

بەڵکو لە خۆشەویست دەپارێمەوە کە بە شایانی ئـەوەم بزانێـت و لە رووی لوتفەوە ئاوڕم لێ بداتەوە.

بـــە گەڕانـــەوە بـــۆ یەکـــەمین بەشـــی ئـــەم بەیتـــە: "لەسەرخۆچـوونە، شــەیدا بوونــە، قــوڕ پێوانــە، ســووتانە"، رووبەڕووی چوار خەسڵەت دەبینەوە کە تێکڕا لە خولگـەی "ئێـش - ئازار" دا دەسووڕێنەوە، و بێگومان هەر دەبێ کۆمەڵێك بن لـەو "ئێش"انەی پەیوەسـتن بـە "عاشـق بـوون" لـەمجۆرە عیـشقەدا. ئەگەرچی خودی عیشقەکە و ئازارەکانی هەر جێی رێزی عاشقن، و ئەگەرچی" ریزی لێ دەگرم - رێزی لێ دەگرم" هـەر بـۆ "تـاك"ە، نەك بۆ "کۆ"، واتە زیاتر بۆ "مەحەببـەت" دەسـت دەدات، بـەڵام زیاتر ئەوە بە پەسەندتر دێتە پێشچاو کە مەبەسـتی شـاعیر "ریـز گـرتن" بێـت لـە "ئێـشەکان"ی مەحەببـەت: "ئێـشی زۆرە"، کـە دیارە "کۆ" یە نەك "تاك"، چونکە:

**سەنەد بێ مۆر و خەط دەعویی مەحەببەت کردنە "مەحوی"**
**تەعەششوق، بێ دڵێکـــی داغـــــدار و سنەیی رێشــــێ**

٥ ی ٧ ل ٣٠٤

ئەم ریز گرتنەش بە کردەوە دەبێت و پێویستی بەوە هەیـە رەنگدانـەوەی تـەواو راسـتەوخۆی لـە ژیـانی عاشـقدا هـەبێ. لـە ئاکامی هەموو ئەمانەشدا لێکدانەوەی سیـستماتیکیی ئـەم بەیتـە،

لە ڕوانگەی خودی میتۆدی شاعیرەوە کە میتۆدی ئەزموونی صۆفیگەرییە، بەم شێوەیەی لێ دێتەوە:

ئەگەر سەرلەبەری ئەزموونی "عیشقی حەقیقی" هەر ڕەنج و ماندوویی و شەونخوونی و شێوە جۆر بە جۆر، و تەنانەت چاوەڕوان نەکراوەکانی ئازار چەشتن نەبێت، ئەوا، بەلای کەمەوە، لە هەر قۆناغێك لەو قۆناغانەی پێویستە عاشق بیانبڕێت، چەندین جۆر هەیە کە لە شێوەی تاقیکردنەوەی تایبەتدا دەردەکەون، و بەشێکی بنەڕەتیی پێکهاتە بناغەییەکانی ئەزموونەکەن، و سەرکەوتن و شکستهێنانی عاشق تێیاندا بەندە بە توانای مامەڵەکردنی، بە شێوەیەکی سەرکەوتوو، لەگەڵ ئەو ڕەنج و ئازارانەدا، هەر ئەو توانایەش بۆی هەیە ببێتە دواپێوەری ڕاستەقینەی شایستەیی خاوەن ئەزموون بۆ ئەوەی بە عاشق ناوببرێت یان نەء. شاعیر چوار جۆری جیاوازی لەو ئازارانە هەڵبژاردووە کە لە خودی ئەزموونەکەدا بایەخی تایبەتی و گەورەیان هەیە، و لە نێو شیعرەکانی شاعیریشدا پاڵپشتیی بەرچاوی خۆیان هەیە:

أ. لەسەرخۆچوون: بە ڕەچاوکردنی مەعنا ئاساییەکەشی، لەسەرخۆچوون جۆرێکە لە جۆرە هەرە بەرجەستەکانی دابڕانی "خود" لە دەوروبەر - بە تایبەتی جیهانی فیزیکی -، ئەو دابڕانە خاڵێکی ئێجگار جەوهەری و گرنگە، و پێشتریش باسکراوە.

هێندەی بۆ ئێرە پێویستە جەختی لەسەر بکرێتەوە ئەوەیە کە مەحوی، لە ئاماژەیەکی ئێجگار ورد و ناسکیدا، ژیانی ئاسایی سەر زەوی و قایل بوون و جڵەو شلکردن بۆ پێداویستییەکانی ئەو ژیانە بە جۆرە بێ هیممەتییەك دەزانێت:

**قاتی پیاوە لەسەر ئەم ئەرزە، دەبینی "مەنصوور" بە سەری دارەوە، (ذاالنون) ە لە بن زیندانا**

١٢ أ ٣ ل ٣٤

بە گشتی، و لە چوارچێوەی "پشتبەستن بە دەقی پیرۆز"دا، بەلای صۆفییانەوە "لەسەرخۆچوون" زادەی دەرکەوتن "تجلی"ی یار – مەعشووق –ە، واتە کاریگەریی ئەو ڕووناکییەی کە نەك تەنها بە شێوەی ڕاستەوخۆ کەس ناتوانێ بەرگەی بگرێ، بەڵکو بە شێوەی ناڕاستەوخۆش – لە ڕێگەی ڕەنگدانەوەی ئەو دەرکەوتنەوە –، ئەمە تەنها چارەنووسی کەسێکی ئاسایی نەبووە، بەڵکو هی پێغەمبەرێك بووە کە بە "کلیم الله – قسە لەگەڵ خوادا کردوو" ناسراوە: **ولما جاء موسى لميقاتنا وكلمه ربه قال رب أرني أنظر إليك قال لن تراني ولكن انظر إلى الجبل فإن استقر مكانه فسوف تراني فلما تجلى ربه للجبل جعله دكا وخر موسى صعقا فلما أفاق قال سبحانك تبت إليك وأنا أول المؤمنين / الاعراف ١٤٣** . بەلای مەحوییەوە – لە هەموو

ئەزموونی صۆفیگەریشدا هەر وایە - دڵ چەقی کاریگەریی ئەو "لەسەرخۆچوون"ەیە، واتە راستەوخۆ "دڵ" لەخۆدەچێ:

**کە دڵ دەتوێتەوە بۆ تۆ، دەکەی ئەو رۆژە تۆ بڕوا**
**کە خۆ دەرخەی وەکو خۆر، دڵ وەکو شەونم لە خۆ بڕوا**

١٣ أ ١ ل ٣٥

بەڵام ئەمە ئەرکە رووبەڕووی دڵ دەبێتەوە، و دەبێ "دڵ" لە ئاستی ئەو ئەرکەدا بێ، واتە بتوانێ بنەماکانی میوانداری رەچاو بکات و پێویستییەکانی دابین بکات، و رێك بەو شێوەیەی کە شیاوی تەشریفهێنانی یار و پێشوازی لێکردنیەتی رەفتار بکات، ئەو رەفتارە گونجاوە تەنها بە مەعنای ئەوە نییە کە بە دەرکەوتنی یار، عاشق خۆی بکاتە قوربانی:

**شەو، هەموو شەو، چاوەڕێیە رۆژ هەڵێ، هەر رۆژ هەڵات**
**مەحوە، سەرتاپا لەبەر پێیا، فیداکارانە شەو**

٣ و ٦ ل ٢٥٨

ئەوە پیشەی عاشقێکە حەز بکات مەعشووق بزانێ چۆن و تا چەند ئەم ئامادەیە خۆی بە قوربانی بکات، بەڵکو مەعنای قووڵتر و پەسەندتر ئەوەیە کە لە هەموو شتێکەوە بتوانێ بۆنی یار بکات، و ئەو بۆنەش بڕست لەم ببڕێت، و پێشئەوەی بە کردەوە یار بگات، ئەم دڵە لێرەوە لەسەرخۆ بچێت، و ئەو

بەڵگەیـەی "هـاتنی یـار" بکاتـە هـەلێك بـۆ ئـەوەی "عـەقڵ" و "هـۆش" ئامـادە بکـات و ئـادابی پێـشوازیی یـار بـەجێبێنێ، ئەگەرچی خۆی ئامادە نییە، چونکە لەسەر خۆ چووە:

**دڵ لەسەرخۆچوونی پەی دەر پەی دەلیلی یارە هات**
**عەقڵ و هۆش، ئەی دڵ، بکە حاضر، لە پێشە کارەهات**[٥١]

---
١ ت ١ ل ٥٦

ب. **شەیدابوون:** ئەمیش هەر جۆرێکە لە جۆرەکانی دابـڕان لە دەوروبەر، لـە جەوهەریـشدا چـەند جۆرێـك لـە جۆرەکـانی ئـەم دابڕانــە بــەخۆوە دەگرێــت. لــە لایەکــەوە دابڕانــە لــە پێــوەرە کۆمەلأیەتییە رەچاوکراوەکان لە بواری جلوبەرگ پۆشین، خۆراك، نووستن و.... تاد، لـە لایـەکی دیکـەوە دابڕانـە لـە ژیـانی ئاسـایی کۆمەڵ. هەروەها دابڕانە لە هۆش و ژینگە و هەموو دەوروبەر و... تاد. ئەگەرچی ئەو شەیدابوونەی لە ئەزموونی صۆفیگەریدا بـەدی دەکرێت دوو بنەمای جیاوازی هەیە لەو شێتییەی هۆکاری دیکـەی لە کۆمەڵدا هەیـە، ئـەو بنەمایانـەش بـریتین لـە پایـەدار نەزانینـی ژیـانی دنیـای بەرجەسـتە بـوو لـە ئـاوەدانی و هـەموو ئـەوجۆرە ئارەزووانەی دەیانورووژێنێ، بەڵکو بە تەواوی بە بـێ نـرخ زانینـی ئەو ژیانە، بۆیە عاشق چۆڵەوانی و بیابـان هەڵدەبـژێرێت و ئەمـەی بە شێتی بۆ لە قەڵەم دەدرێ، واتە ئـەم شـەیدابوونە دەرەنجامـی

لێکدانــەوە و هەڵــسەنگاندنی نرخــی راســتەقینەی شــتەکانە، و هەڵبــژاردنی بــەنرختر و پایەدارترەکــە لەســەر بناغــەی ئــەو هەڵبژاردنە. دووەمین بنەما پتر بە "جوانیی لە رادەبەدەری یار" باس دەکرێت، ئەو جوانییەی بە ئاسانی بەرگەی ناگیردرێ. ئەگەرچــی ئــەم دوو بنەمایــە "شــەیدابوون"ی عاشــقانە " لــە "شێتبوونی ئاسایی" جودا دەکەنەوە، بەڵام هەردوکیان لەوەدا یەکدەگرنەوە کە ئەو دابڕانانەی ئاماژەیان بۆ کرا لە هەردوکیاندا بەدی دەکرێن.

یەکەمین بنەمای شەیدا بوون پەیوەندیی بەوەوە هەیە کە رێوڕەسمی "عیشقی حەقیقی"، کە کۆمەڵێك رازی گرنگی تایبەتی لەخۆدا چڕکردۆتەوە، پشت بە رێز نان لەو رازانە و پاراستن و بە پیرۆز زانینیان دەبەستێ. لە شار و ئاوەدانیدا.. واتە لە گەرمەی ژیانی ئاساییدا کە کەس لەو رازانە تێناگات و بە جۆرە لادان شتییەکیان لە قەڵەم دەدەن، زەمینە لەبار نییە بۆ پەیڕەوی کردن لەو رێوڕەسمانە، بۆیە ئاساییە پەنا ببرێتە بەر بیابان:

**بــەجێ نــایێ، دەبــێ روو کەینــە ســارا حــەقی ئادابــی مەجنوونی لە شارا**

٣ أ ١ ل ٧

**رەم دەکا حەتتا لە میهر و مەه جونوون ئاباد[٥٢] ی عیشق**
**سـێبەری لێ بارە هـەرکەس مەیلـی تەنهـایی بکا**
٦ أ ٥ ل ١٨

دووەمین بنەمای شەیدابوون هەمان ئەو رووناکی "نـوور" ە بـێ هاوتـا و بـێ وێنەیەیـە کـە لـە خـاڵی " أ "، واتـە "لەسەرخۆچوون"دا ئاماژەی بۆ کرا.. هەر ئەو جوانییەی عاشـقی بەرەو "لەسەرخۆچـوون" بـرد، بـۆی هەیـە بـەرەو "شـەیدابوون" یشی بەرێ:

**بە جیلوەی ئەو، وەکو شەونم فڕی هەر عەقڵ و هۆشێ بوو**
**کە سێبەر مەحوە لەو جێیـە هەتاوی لەحظەیەك لێ کـەوت**
١٢ ت ٧ ل٨٦

**شـەوێ لەیـلا بە مەجنوونی دەوت: بنـوارە حاڵـی خۆت**
**بە خـۆڕایی کە چۆنت دا بە بـا عەقڵ و کەمـاڵی خۆت**
**جوابی دایەوە مەجنـوون، ئەگـەر طاقەت ببێ لەحظـێ**
**لەنـاو ئاوێنـەدا بنوارەرە حوسـن و جەمـاڵی خۆت**
ل ٣٣١

**برا مەردم دەوێ عەقڵی نەلەنگێ بە لەنجـەی ناز و عیشوەی نەونەمامان**
٣ ن ٣ ل ٢٤٢

پێویستە ئاماژە بۆ ئـەوەش بکـەین کـە بـەلای مەحوییـەوە دەرکــەوتن - یــان دەرخــستن -ی جوانــیی یــار، نــەك تەنهــا دەبێتەمایــەی تێکــچوون و شــڵەژانی مــرۆڤ، بــەڵکو بوونــەوەری دیکەش:

**کەی بــە لەعل و گەوهەر ئەو لێــو و ددانــی دا نیشـان...**
**ئەو رەهنـدەی شاخە، ئەم خۆشارەوەی ژووری صەدەف ؟**

١ ف ٥ ل ١٧٥

ج. قورپێـوان: ئەمیـشیان کردەوەیـەکی نائاسـاییە، و بـە رەچاوکردنی ئەوەی، تەنانەت لە کارەساتە گەورەکانیشدا، کەمـتر دەتوانـرێ پیاوێـك لـە حاڵـەتی "قورپێـوان"دا ببیـنرێ، دەتوانـین ئەمیش هەر بە شێوەیەك لە شێوەکانی دابڕان لە کۆمەڵ "دنیـا - ژیـانی ئاسـایی" لـە قەڵـەم بـدەین، ئـەو دنیایـەی هـەرگیز لەگـەڵ عیشقدا، پێکەوە، کۆ نابنەوە:

**قوڕێ بکـەم بە ســـەرا، یان بـــە دادڕینـــی بەرۆك**
**حەقی مەحەببـەت ئەدا کەم، بدەی خودایا دەسـت**

٥ ت ٣ ل ٧٠

**رووتی دی، لەو ڕۆژەوە، گەر ڕۆژە سەرگەردانە ڕۆژ**
**گەییــە ئێــوارە، وەکو من، ئیشی قوڕپێوانـــە ڕۆژ**

١ ژ ١ ل ١٣٧

**شوکر یار ئیذنی دام هەم گریە کەم، هەم قوڕ بەسەردا کەم**
**بە جارێ شاهی من بەحر و بەڕی بەخشی بە دەروێــشـــێ**

٥ ی ٣ ل ٣٠٣

د. سووتان: لە یەکەمین بەیتی ئەم غەزەلەوە، بـە درێـژی، لە شوێنی تایبەتی ئەم چەمکە لە عیشقدا قسە کرا. سووتان/یش، بــە رەچـاوکردنی پێـوەرە کۆمەڵایەتییــە باوەکـانی چوارچـێوەی جیهـانی فیزیکـی، بـۆ پیـاو، زۆر نائاسـاییە، و بەمـەش هـەر ئـەو دابڕانە لە جیهان دێتەئاراوە کە پێشتر لە "قوڕپێـوان"دا بـەدیکرا، تەنها یەك خاڵی گرنگ، کە یـەکێك لـە تایبەتمەندییـەکانی شـیعری مەحوی دەخاتەڕوو، ئەوەیە کە سووتانی گەیاندۆتە ئـەو ئاسـتەی چیدی لە لە کیان و جەستەی عاشقی سووتاودا ناتوانرێ بـە دوای شــوێنێکی مــاددی، شــوێنێك بخرێتــەژێر رکێفــی دوورایيـــە ئاساییەکانی ماددەوە "وەکو درێژی و پانی و قووڵـی و... تـاد"دا بگەڕێین، تەنانەت گیان - ڕۆح -یش کە لـەو دوورایيانـەوە دوورە - "یار" ی تێدا دابنرێ:

**نەما جێی ئەو جگەرگۆشە، مەگەر رۆح و ئەویش دەڕوا،..**
**جگـــەر سـۆزانە، دڵ بریانـــە، دیـدە پڕ لە گـــریانـــــە**

٧ هـ ٩ ل ٢٧٩

لەمەشدا بە رادەیەك رۆچووە کە ناتوانرێ باس لـە پێـوەرە ئاسـاییەکان و جـێ و شـوێنی ئاسـایی، و تەنانـەت پەیوەندییـە ئاسـاییەکانی ئـەو شـتانە بکـرێ کـە لـە بـواری بـەرینیی عیـشقدا فەرمانڕەوان:

**بێ داغی نەدامەت دڵ، و بێ دەردی ئەســەف جان**
**لەم کالیبــەدە دڵ، لە دڵ ئــەو جانـــە حەرامـــــە**

٦ هـ ٨ ل ٢٧٦

**چ شـــۆخە، ئاگـــرم تێ بــەردەدات و پێـــم دەڵێ یا شـــێخ**
**بە خاشـاکی دەوت: شـوعلە - عەصـامە، دەسـتی پێ دەگـرم**

ئەمە یەکێکە لەو بەیتە کەمانەی "مەحوی" کـە ماوەیەکـی دوور و درێـژ بـەخۆوەی خـەریککردووم، و تایبەتمەنـدیی ئەمـەش لەوەدایـە کـە نـەدەتوانم بـە شـیاویی لێکدانـەوەی نێـو "دیوانـی مـەحوی" بـۆ ئـەم بەیتـە قایـل ببـم، و نەخۆیـشم گەیـشتوومەتە لێکدانەوەیەك بتوانێ تینوویەتیم بشکێنێت و دڵنیاییم پێببەخشێ. "گرێ کوێرەی" ئەم بەیتەش لە دووەمـین بەشـیدایە. بـا سـەرەتا لەو شێوە نووسینەوە دەست پێ بکەین، بە خاڵبەندیشەوە، کە لە

"دیوان"دا بەدیی دەکەین: **"بە خاشاکی دەوت: شوعلە، عەصامە دەستی پێ دەگرم"**، ئەو کۆما " ، "یەی پاش وشەی "شوعلە" دانراوە، چ رۆڵێك دەگێڕێت و دەتوانێ خزمەتی چ مەبەستێك بکات!؟

ئەگەر باس لەوە بکەین گوایە سەرجەمی ئەو دووەمین بەشە لە دوو رستەی ناتەواو پێکهاتووە، و پێکەوە رستەیەکی تەواویان لێوە پێکدێت و ئەو کۆمایە لێکیان جودا دەکاتەوە، ئەوا بە هەڵەدا چووین، چونکە بەو شێوەیەی لێکجودا کراونەتەوە، لە لایەکەوە هەردوو رستەکە تەواو و سەربەخۆن. لە لایەکی دیکەشەوە ئەگەر سوور بین لەسەر ئەوەی ئەو کۆمایە، هەر بەو شێوەیەی خۆی، دابنرێ ئەوا رووبەڕووی دوو رستەی ناتەبا و هاودژ دەبینەوە: لە یەکەمیاندا خاشاك "پووش - چیلکە" بە شوعلە "بڵێسە" دانراوە، کەچی لە دووەمین رستەدا بە عەصا "داردەست - گۆچان" ناوبراوە. بڵێسەش، نەك هەر دەستی پێوە ناگیرێت و دەست دەسووتێنێ، بەڵکو ئەگەر ئەو خاسیەتەشی نەبایە - واتە توانای سووتاندن -، ئەوا هەر نەدەکرا بە دەست بگیرێت. بەمەش.. لە سایەی ئەم پەیوەندییە ئاڵۆزانەدا، ناتوانرێ سەرە دەزووە پێویستەکان، کە بە شێوەیەکی سەیر لێك ئاڵێنراون، بۆ لێکۆڵینەوەیەکی مەنتیقیی پشتئەستوور بە کۆمەڵە زانیارییەکی روون و بە جوانی پۆلێنکراو، بدۆزرێنەوە.

لــە لایــەکی دیکەشــەوە، و لــە چوارچــێوەی کۆشــشی لێکدانەوەیەکی تازەدا، ئەگەر بێین و حاڵەتی گشتیی عاشق، لەم جۆرە عیشقەدا، بێنینە پێشچاو، ئەوا کەسێکی لەڕ و لاواز و رەنگ زەردی بــە رواڵــەت بێهێزمــان دێتــە پێشــچاو، کــە بــە هــەموو پێوەرەکان دەتوانرێ بە پــووش و چــیلکە و چــەوێڵ بــشوبهێنرێ. مەنتیقی ئەو وشك و لەڕییەی "عاشق" لە نێو خــودی شــیعرەکانی "مەحوی"دا چەندین بنەماو بناغەی بــەهێزی هەیــە. لــە لایەکــەوە سروشــتی عیــشق خــۆی عاشــق بــەرەو فــەوتان و نــەمان دەبــات. "مەحوی" لە بەیتێکیدا ئەم مەسەلەیەی لە چوارچێوەی گشتییدا چارەسەر کردووە، واتــە لــە ســنووری حوکمــدان بەســەر شــتدا لــە چوارچێوەی رەچاوکردنی خاسیەت و تایبەتمەندییــەکانی هــەردوو لایــەنی کارلێکەکــە: ئــەوەی کاریگــەرە و ئــەوەی دەکەوێتەژێــر کاریگەرییەوە:

**ئینســافی دا کە دی تەبی عیشــقم لە شــیددەتا**
**حەقیــە، وتی: بەم ئاگــرە گــەر بشــــتوێتەوە**

١١ هـ ٧ ل ٢٨٧

ئەگــەر واش نــەبێ دەبــێ لــەنگی و ناهاوســەنگییەك لــە هاوکێشەکەدا هەبێ، نەك هــەر لــە تێکڕای عیــشقدا(٥٣)، بــەڵکو لــە بوارێکــی ئازارەکانیــشیدا - جودایــی و لێــك دوور کەوتنــەوە بــۆ

نموونە –، ئەگەر گیان، بە ڕۆیشتنی یار دەرنەچێ، لە مەنتیقی شاعیردا، یان دەبێ گیانەکە نائاسایی بێت، یان ئەوەی بە "عیشق" ناودەبرێت هەر دەبێ لاف و گەزاف بێت:

**جان سەختە، یان لە دەعویی عیشقا درۆزنە ؟**
**ئەو زیندە ماوە تا لە سەفەر یاری دێتەوە !**

١١ هـ ٢ ل ٢٨٦

لە روویەکی دیکەشەوە، دەبێ عاشق هێندەی لەباردا بێ کە دنیا و هەموو ئارەزوو و خۆشییەکانی، لە روانگەی گشتییەوە –بە خۆراك و خواردنەوەشەوە – دووربخاتەوە، و لە بیر و خەمی هەموو شتێکدا بێت کە رەنگە بتوانن زیان بە ئەزموونەکەی بگەیەنن. ئەگەر ئەمەی کرد بەلای مەحوییەوە "مەرد"ە، و ئەگەر بە راستی مەرد بێت ناتوانرێ، وەکو بەشێکی زۆری ئەو خەڵکانەی رۆژانە دەبینرێن، لە ئەرکەکانی عیشقەکەی دووربکەوێتەوە، و لە بەردەم دەرگای پیرۆزی عیشقدا شەرمەزار بێت:

**عەجیبم دێ لە عەقڵی ئەو کەسە وا تێ دەگا مەردە**
**کەچی وەك خان و خانم دائیما دڵخۆش و بێ دەردە**

**بە پیری مەرگەوە فرسەخ بە فرسەخ رۆییون مەردان**
**ئەوی باکی لە مردن بێ دیارە بڵح و نامەردە**

**لەبـەر قاپیی مەحـەببەت ئـەو خـودا پێـداوەیە رووسوور**
**حەزینــە، دیدە پڕ ئەسـرینە، دڵ خــوێنینــە، رووزەردە**

٤ هـ ١ تا ٣ ل ٢٧٠

لــە سـێیەمین لاشــەوە، هێنـدەی پەیوەنـدیی بـە وشــەی "پووش" و هاومەعناکانییـەوە هەیـە، "مـەحوی" هـەم لـە بـواری کاریگەرییە سروشتییەکاندا، بە حوکمی تەمەنیشەوە، لەم لاوازییە دواوە کە بەو رادەیە کاردەکاتە سـەر مـرۆڤ کـە دەیکاتـە پـووش، وەکو:

**پیری نەمامــی باغـی جوانیمــی کـــردە پووش**
**تازەم درەختــی طوولــی ئەمەل دەردەکـا چـرۆ**

١ و ٥ ل ٢٥٤

هـــەم لـــە رووی ئـــەو هۆکارانەشـــەوە کـــە پەیوەندیـــی راستەوخۆیان بە ئـەزموونی عیـشقی حەقیقییـەوە هەیـە، واتـە لـە رووی زاراوەیــی - ئیــستیلاحی -شــەوە باســی ئــەو وشــەیەی کردووە:

**لەبــەر زار و نــەزاری بوومــە وەك پــووش دە ئەمجـا رابوێـرە من بە زارا**

٣ أ ٥ ل ٩

بـەڵام، وەکـو لـە دووەمـین بەشـی یەکـەمین بـەیتی ئـەم غەزەلەدا، کە لەم نووسینەدا هەوڵدراوە لە روانگەیەکی تایبەتـەوە

بخوێنرێتەوە، واتە لە **"کە من مشتێ چڵ و چێوم بە چی بم، کەڵکی کێ دەگرم؟"** دا دەردەکەوێ، "مەحوی" چ مەنتیق و چ شیاویی "بە پووش بوون"ی بۆ سووتان فەرامۆش نەکردووە، بەمەش پاساوی جیهانی فیزیکی بۆ گۆڕانکارییەکانی نێو جیهانی ئەزموونی صۆفیگەری، واتە "عیشقی حەقیقی" گواستۆتەوە، نموونەیەکی دیکەی ئەوەش ئەمەیە:

**وتم: عیشق ئاگری گرتە وجوودم وتی: هەر بابەتی سووتانە خاشاک**

١ ك ٨ ل ١٨٧

تا ئێستا رەنگە بنەماکانی خاشاک "پووش - چیلکە و چەوێڵ - چڵ و چێو" بوون خرابێتنەڕوو، پێویستە ئەوەشمان لەبیرنەچێ کە لە نێوان خاشاک و شوعلە "بڵێسە"دا، جگە لەوەی ئاماژەی بۆ کرا، پەیوەندییەکی دیکەش هەیە، بریتییە لە نزیکی رەنگ - ئەو رەنگەی عاشقیش لە ژێر هەمان چەتردا کۆدەکاتەوە: رەنگی زەردی کاڵی بێ بریسکە و مات - تبنی "رەنگی کا" -، لێرەوە ئەگەر بە خاشاک بگوترێ "شوعلە" ئەوا بە عاشقی ئاگر تێبەردراویش گوتراوە "شوعلە"، و دەزووەکانی پەیوەندیش روونکراونەتەوە، بەڵام دەبێ چ پەیوەندییەک لە نێوان ئەمە و رستەی "عەصامە دەستی پێ دەگرم"دا هەبێ؟

با هەوڵبدەین، لە یەکەمین قۆناغدا، لێکدانەوەی راستەوخۆ و ئەگەرە شیاو و مەنتیقییەکانی لێکدانەوەی ئەو رستەیە بخەینەڕوو. راستەوخۆ شاعیر وشەی "عەصا - گۆچان" دەکاتە چەقی رستەکە و هەمان ئەو ئەرکە سروشتییەشی پێدەسپێرێ کە پێیناسراوە: "دەست پێوەگرتن... **عەصامە دەستی پێ دەگرم**". عەصایەکیش بە کردەوە دەستی پێوەبگیرێت، بەلای خاوەنەکەیەوە گەلێك گرنگە، چونکە هاوڕێی بەردەوامیەتی و یارمەتیی دەدات، و لە هێندێ حاڵەتی تایبەتیشدا - لە کاتی تاریکداهاتنی دنیا و لە شوێنی هەڵەت و بەردەلاَندا و لە هەورازە کووڕەکاندا - ئەو یارمەتییە گەورەتر دەبێت و دەگاتە پلەی دەستگیرۆیی تەواو و رینوێنیکردن - رێپیشاندان -، بە تایبەت ئەگەر ماندوویی و تەمەن ونەخۆشی بڕستیان لە خاوەنەکەی بڕی بوو بێت.

لەم بواری لێکدانەوەی راستەوخۆیەدا چەندین ئەگەرمان لەبەردەمدایە کە تێکڕا لە لێکدانەوە شیاوەکانی هەردوو وشەی "عەصا" و "دەست" و ئیدیۆمی "دەست پێگرتن- دەست پێوەگرتن"ەوە هەڵدەقووڵێن. وشەی "عەصا - گۆچان"، جگە لەو دوو مەعنا باوەی ئاماژەیان بۆ کرا، کە هەردوکیان کاریگەر و ئیجابین، دەتوانرێ بە مەعنایەکی دیکەش: "داردەست" بەکاربهێنرێ، واتە ئامێر و ئامرازی جێبەجێکردنی ئەرکێکی

دیاریکراو، یان چەند ئەرکێکی جیاواز، لە یەککات یان چەند کاتێکی جیاوازدا. لە قورئانی پیرۆزدا نموونەیەکی ئاوەهامان خراوەتە پێشچاو: **قَالَ هِيَ عصاي أتوكّأ عليها وأهشّ بها علـى غَنمِي ولِي فِيها مآرب أخـرى / طـه ١٨** ، بەلاّم پێموایە بۆ شوێنێکی ئاوەها تایبەتدا ئەم بەکارهێنانانەی "عەصا" مەبەستە:

**وإذ استسقَى موسى لِقَومِهِ فَقُلْنا اضرب بّعصاك الْحجر فَانفَجرت مِنه اثْنتا عشرةَ عيناً قَد عِلم كُلّ أناسٍ مّشربهم كُلُواْ واشربواْ مِـن رّزق اللّهِ ولاَ تعثَواْ فِـي الأَرض مفْـسِدِين/** البقـرة ٦٠ [٥٤] و **فَأوحينا إِلَى موسى أن اضرب بِعصاك الْبحر فَانفَلَق فَكَانَ كُل فِرقٍ كَالطودِ الْعظِيمِ / الشعراء ٦٣** و **وألق عصاك فَلَمّا رآها تهتـزّ كَأنّها جانّ ولّى مدبرا ولَم يعقّب يا موسى لا تخف إِنّي لا يخـاف لَديّ الْمرسلُونَ / النمل ١٠** [٥٥] .

وشەی "عصا - عەصا" لە هەر سێ ئایەتی بە نموونە هێنراودا ئاماژەیەکی ئێجگار گرنگی بەخۆوە گرتووە کە بریتییە لە "لە ئامێز گرتن"ی سێ شێوە بەکارهێنانی نائاسایی "موعجیزە"ی یەك پێغەمبەر کە حەزرەتی "مووسا"یە(ع)، ئەمەش جۆرێکی تایبەتی بەکارهێنانە و بۆی هەیە دەروازەیەکی دیکەی لێکدانەوەمان بۆ بکاتەوە. وشەی "دەست" لە لێکدانەوەی دووەمین بەیتی ئەم غەزەلەدا هەوڵدراوە بە بەڵگەوە ئەوە روونبکرێتەوە کە، جگە لە مەعنا ئاساییەکەی، هەردوو

مەعنای "دەسەڵات" و "کاریگەری"ش بەخۆوە دەگرێ، چ لە شیعری مەحویدا بە تایبەت ، چ لە شیعری کوردیدا، و چ لە بەکارهێنانی رۆژانەی ئاسایی زمانی کوردیشدا بە گشتی. لێرەدا "**دەست پێ گرتن**"، بە رەچاوکردنی ئەو راستییەی کە "پێ"، لەو نێوانەدا، کە بەشدارە لە پێکهێنانی ئیدیۆمێك بەو شێوەیەی تۆمارکراوە: "دەست پێ گرتن"، مەعنای "بە" دەبەخشێت و بۆ وشەی "عەصا" دەگەڕێتەوە، دەتوانرێ سەرلەنوێ، بە دوو شێوەی جیاواز، لە رووی پێکهاتە و مەعناشەوە، دابڕێژرێتەوە و پێکهاتەی تازەی لێوە بەدەست بهێنرێت: "دەست بە عەصا - بە عەصاوە - دەگرم" و "بە عەصا، دەست دەگرم". لە یەکەمین پێکهاتەدا، روونە کە مەبەست هەر "دەست پێوەگرتنە" بەو مەعنایەی بکرێتە ئامرازی یارمەتیدان بۆ ئەنجامدانی کارێك یان چەند کارێکی دیاریکراو. بەڵام لە دووەمین شێوەی داڕشتنەوە - پێکهاتە - دا "دەست گرتن" خۆی دەبێتە "ئیدیۆم"ێکی تایبەت و مەعنایەکی تازە و جیاواز دەبەخشێت کە بریتییە لە: "**توانای بەکارهێنانی دەست پەیدا دەکەم**" یان "**توانای بەکارهێنانی دەستم لا دروست دەبێ**"، هەڵبەتە بە رەچاوکردنی ئەوەش کە وشەی "دەست" هەر مەعنا ئاساییەکەی ببەخشێت یان مەعنای "دەسەڵات" و "کاریگەری" ببەخشێت. ئەم شێوە بەکارهێنانە هاوشێوەی ئەم بەکارهێنانەی "پێ گرتن - پێ دەگرم"ە:

**لە پێ کەوتووم و نەفسم بۆ هەوا دەشنێ وەکو منداڵ**

**لەبەر پیری سەرم خۆی ناگرێت، و تازە پێ دەگــــرم**

٥ م ٥ ل ٢٢١

ئاشکراشە کە لێرەدا "پێ دەگرم" مەعنای "توانای بەکارهێنانی پێ بۆ رۆیشتن پەیدا دەکەم، یان وەدەست دێنم" دەبەخشێ. ئەمە یەکێکە لە ئەگەرە شیاوەکانی "دەستی پێ دەگرم"، کە ناڕاستەوخۆیە، و یەکەمین لێکدانەوەش راستەوخۆ بوو. بەڵام لێرەدا، هەر بەو شێوەیەی لە وشەی "عەصا"شدا بەدی کرا، "دەست"یش هەر لای هەمان پێغەمبەر - مووسا (ع) - بابەتی موعجیزەیەکی دیکەیە: **وأدخِلْ يدكَ فِي جيبِك تخرج بيضاءَ مِن غَير سوءٍ فِي تِسع آياتٍ إِلى فِرعونَ وقَومِهِ إِنّهم كانوا قَوما فاسِقِين النمل ١٢** ، مەحوی ئاماژەی روونی بۆ ئەم موعجیزەی "دەست"ەی حەزرەتی مووسا هەیە:

**بە دەســتی غونچــە دەمێ، دەستی دا کە بەیعــەت بۆم**

**چ ئارەزوومــە لە (عیســـا) دەم و لە (مووسا) دەســت**

٥ ت ٨ ل ٧١

بە وردبوونەوە لە تێکڕای دووەمین بەشی ئەو بەیتە، ناچار دەبین سەرلەنوێ بگەڕێینەوە بۆ لای وشەی "شوعلە"، کە بەو پێیەی لە چەند لاپەڕەی پێشوودا لێکدرایەوە، هەم لە رووی مەنتیقی و هەم لە رووی رەنگەوە پەیوەندیی بەهێز لە نێوان "بە پووش -

خاشــاك - بــوون" و "ســووتان"دا هەیــە. وشــەی "شــعلة" کــە عەرەبییــە و مــەعنای "بڵێــسە" دەبەخــشێت، و دەرەنجامــی راستەوخۆی ئاگرە - ئاگرکەوتنەوە لـە شـتێکی وەکـو پـووش -، هــەر لــە زمــانی عەرەبیــدا هــەردوو وشــەی "قبــس" و "جــذوة" بەرانبــــەری بــــەکاردەهێنرێن.. ئــــەو "ئــــاگر"ە سەرچــــاوەی رێپیشاندەری بوو بۆ خودی حەزرەتی مووسا: **يا موسى إنّه أنـا الله العزيز الحكيم (٩) وألق عصاك فلمّا رآها تهتزّ كأنّها جانٌّ ولّى مدبرا ولم يعقّب يا موسى لا تخف إنّي لا يخاف لديّ المرسلونَ / طه ٩ و ١٠** . ئەوەی زیاتر دەتوانرێ ئامـاژەی بـۆ بکرێـت و بـە هەند وەربگیرێت لەو نیوە بەیتەدا ئەو خاڵەیە کە لـە ریزبەنـدی - ترتیب - ی وشەکاندا وشەی "شوعلە" یەکەمیانە، پاشان وشـەی "عەصا" و پاش ئەوەش وشـەی "دەسـت" دێـت: "بـە خاشـاکی دەوت شــوعلە، عەصــامە دەســتی پــێ دەگــرم". لــە قورئانــی پیرۆزیشدا، و رێك لە بواری ورووژاندنی موعجیـزەی رێپیـشاندان - هدایە، هـدی - دا، کـە ئـاگر "قبـس - جـذوة" سەرچـاوەی بـوو، چوار ئایـەتی یـەك لـە دوای یـەکی هـەمان سـوورەت، هـەمان ئـەو ریزبەندییــەی هەرســێ وشــەی "جــذوة - شــوعلە" و "عــصا - عەصا" و "ید - دەست"ی تێدا بـەدی دەکـرێ: **فلمّـا قـضى موسى الأجلَ وسار بأهله آنس من جانب الطّور نارا قـالَ لأهلـه امكثوا إنّي آنست نارا لعلّي آتيكم منها بخبر أو جذوة من النّـار**

**لَعَلَّكُم تصطَلُونَ (٢٩) فَلَمَّا أَتاها نودِيَ مِن شاطِئِ الْوادِ الأيمنِ فِـي الْبقْعةِ الْمباركَةِ مِن الشَّجرةِ أَنْ يا موسى إِنّي أَنا اللَّه ربُّ الْعالَمِ (٣٠) وأَنْ أَلْقِ عصاك فَلَمَّا رآها تهتَزُّ كَأَنَّها جانٌّ ولَّى مدبِرا ولَم يعقِّب يا موسى أَقْبِلْ ولا تخف إِنَّك مِن الآمِنِ (٣١) اسلُك يدك فِي جيبِك تخرج بيضاءَ مِن غَير سوءٍ واضمم إِلَيك جناحك مِن الرَّهبِ فَذَانِك برهانانِ مِن ربِّك إِلَى فِرعونَ وملَئِهِ إِنَّهم كَـانوا قَومـا فَاسِـقِ / القصص ٢٩ تا ٣٢ .**

ئەگـەر ئـەم ئاماژەیـە، بـە هـەموو هێڵـە گـشتییەکانییەوە، پەسـەند بکـەین، دەبـێ لـە لایەکـەوە مەسـەلەی ئەزموونـی صۆفیگەری "عیشقی حـەقیقی"، بـە هـەموو ئامـاژە و پابەنـدی و ئەرکەکانییەوە - وەکو لە لێکدانەوەی هـەردوو بـەیتی "٤ و ٥"دا روونبوونـەوە - بێنینـەوە بـیری خۆمـان، بـە چـەمکی دەرکەوتـن "التجلی" و ئاماژە بۆ ئایەتی (الاعراف ١٤٣) شەوە، کە لە رێگەی هەمان پێغەمبـەرەوە، "حـەزرەتی مووسـا (ع)"، کاریگـەریی ئـەو چەمکە روونکرایەوە، و لە لایەکی دیکەشـەوە، ئەزموونەکـەش بـە شێوەیەکی گشتی وەربگرین... ئـەزموونی عیـشق بـە گـشتی، کـە ئـەزموونی مـرۆڤ و بـەها و شـوێنی تایبـەتێتی لـە بوونـدا، نـەك ئـەزموونی عاشـقێکی دیـاریکراو، واتـە ئـەزموونی ئـەو رێـزە گەورەیەی لە مرۆڤ نراوە... ئەو رێـزەی مرۆڤـ لـە رێگەیـەوە، لـە لایەن ئافەریدەکارەوە، بەسەر بەشێکی گـەورەی بوونەوەرانـدا لـە

پێشتر و بەرێزتر دانراوە: **ولقد كرّمنا بني آدم وحملناهم في البرّ والبحر ورزقناهم من الطيّبات وفضّلناهم على كثيرٍ ممّن خلقنا تفضيلاً الاسراء ٧٠ .**

ئا لێرەشەوە یەکێك لە تایبەتمەندییە هەرە بەرجەستە و گرنگەکانی ئەم غەزەلە و شیعری "مەحوی"، بە گشتی، دەست پێدەکات، ئەو تایبەتمەندییەی لە خولگەی بەها "نرخ"ی مرۆڤدا دەسوورێتەوە.

لێرەشەوە. پێشئەوەی دووەمین بەشی ئەو بەیتە لێکبدەینەوە، پێویستە بگەڕێینەوە بۆ یەکەمین بەشی: **"چ شۆخە ئاگرم تێ بەر دەدات و پێم دەڵێ: یا شێخ"**، وشەی "شۆخ" هەرگیز مەعنای "عەیار"[٥٦] و "زۆرزان" نابەخشێ، ئەگەرچی لە ئەدەبییاتی صۆفیگەریدا ئەو دوو وشەیە بە زۆری بەکارهێنراون و ئاماژەش بوون بۆ دەسەڵاتە شکست نەدیتوو و تایبەتەکانی مەعشووق. وشەی "شۆخ"، لێرەدا، سەرەڕای ئەوەی لە رووی زیهنییەوە بە دەسەڵاتی جوانیی بێ وێنەی یارەوە گرێدراوە، ئاماژەشە بۆ خاوەندارێتیی تێکڕای خەسڵەتەکانی جوامێری، بەو خەسڵەتەشەوە کە وێڕای دەسەڵاتی بێ سنووری بەسەر عاشقەکانی، و بەڵکو بەسەر هەموو بوونەوەرەکانیشدا، بەڵام نرخ و بەها و پایەی عاشقی لا پارێزراوە، هەر ئەم خاڵەش مایەی سەرسامیی عاشقە بەرانبەر مەعشووق: **"چ شۆخە!"**،

روونکردنەوەی هۆکاری ئەم سەرسامییەش راستەوخۆ پاش ئەوە دێت: **"ئاگرم تێ بەردەدات"**. ئەمە دەسەلاتێکی بەردەوام و ئەزەلیی عیشقە، و لەو ریگەیەشەوە مەعشووق، تەنانەت بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و هەست پێنەکراویش، ئەو دەسەلاتە ممارەسە دەکات. هەمیشە لە رێگەی "عیشق"ەوە ئاگر لە "عاشق" بەردەدرێ، بەلام وێرای ئەوەش رێزی لێدەنرێ: **"پێم دەڵێ: یا شێخ"**.. رێز لەوەی عیشقی هەلبژاردووە، ئەو عیشقەی عاشق لە ریزی مرۆڤی ئاسایی دەردەکات و هێندە لە عیشقدا قاڵی دەکات کە تەنها مەعشووقی بوێت و لەو پێناوەشدا دەست لە دنیایەك هەلبگرێت کە هۆکارەکانی پەیوەستبوون بەو دنیایەوە ئێجگار بەهێزن:

**لە پێ حەرامە زڕەی سیلسیلەی موقەددەسی عیشق**
**ببی بە شێر و مەگەر هەڵگری لە دنیا دەست**

٥ ت ٦ ل ٧٠

رێز لەو عیشقە دەگرێت کە شەڕگەیەکی بەردەوامی عاشقە دژی هەموو شتێکی سەر بەم دنیایە بە "خۆیی بوون - خۆیەتی - هەوڵی هێشتنەوە و پاراستنی خود"یشەوە. لە شەڕگەیەکی ئاوەهادا مرۆڤ، با چەك و تفاقیشی تەواو بێت، ناتوانێ بە تەنێ بجەنگێ:

**بە بێ "یار"ێ مەچۆرە مەعـرەکەی ئیســفەندیاری نەفس**
**کە لـەم مەیـدانــەدا هـەر پیرە زاڵــە رۆســتەمی بێ زاڵ**
ا ل ٨ ل ٢٠٣

ریـز لــەو مرۆڤــە عاشــقە دەگــرێ کــە بــە راسـتی خـۆی خـستۆتەژێر بـاری عیـشقێکی ئـەوتۆوە کـە ئاسمـان و زەوی و چیاکان ئەو بارەیان هەڵنەگرت.. ئەو عیشقەی هەرگیز ناتوانرێ بە بێ ئەزموونێکی راستەقینەی سەخت باسی لێوە یکرێ:

**لەبەر باری مەحەببـەت ئاســمان و ئەرز دەناڵێـــنن**
**چییـــە ئەم دەعوییـەت زاهید، جلی لێ بارە گاپیـرت**
٤ ت ٨ ل ٦٨

نموونەی بالاَی ئەم رێزگرتنە لە هەردوو ئایـەتی (آل عمـران ٧) و (المائدة ٥٤) دا دەردەکەوی کە پێـشتر لـەم خوێندنەوەیـەدا بە بەڵگە هێنرابوونەوە، یان لە چەند فەرموودەیەکی قودسیدا، کە یەکێکیان: "من عادى لي وليا فقد آذنتـه بـالحرب .."ە – ئەویـش هەر لەم خوێندنەوەیەدا بە بەڵگە هێنراوەتـەوە –، ئـەو رێزلێنانـە لە شێوەی بـانگکردن بـە: "یـا شـێخ" [٥٧]دا رەنگدەداتـەوە، ئـەو شێوەیەی لە کوردەواریدا بەڵگەی رێزێکی گەورەیە. جێـی ئامـاژە بۆ کردنە کە لە کۆمەڵی ئێمەدا وشەی "ســەیید" پـتر بـۆ ئەوانـە بەکاردەهێنرێ کە بە نەوەی پێغەمبـەر (ص) دەزانـرێن، و وشـەی

"شێخ"یش زیاتر پەیوەستە بەوانەی لە ڕێگەی خواپەرستییەوە پێگەیشتوون، ئەگەرچی بە نەوی پێغەمبەر (ص)یش هەر دەگوترێ شێخ و لەو حاڵەتەشدا بەوانەی بە خواپەرستی گەیشتوون دەگوترێ "شێخی بەرماڵ". لە پرنسیپە بناغەییەکانی ئایینیشدا ئەمجۆرە پێگەیشتنە، بە پێی پلە تایبەتەکانی، مایەی ڕێزی ڕاستەقینەیە: **يا أيها النّاس إنّا خلقناكم مِن ذكَرٍ وأنثَى وجعلناكُم شعوبا وقَبائِلَ لِتعارفُوا إنّ أكْرمكُم عِند اللّهِ أتقَاكُم إنّ اللّه عِليم خبِير // حجرات ١٣** ، ئاشکراشە کە جەختکردن لەسەر "ان اكرمكم عند الله أتقاكم - بەڕێزترینتان لای خوا لەخوا ترساوترینتانە"، لەم ئایەتە پیرۆزەدا چ جۆرە ڕێزێکی بۆ ئەو جۆرە کەسانە داناوە.

ئەوەی "مەعشووق - یار" بە "یا شێخ" بانگی دەکات، هەر خۆی ئەو "باخەوان"ە ئەزەلییەیەتی کە بە "سێو" ناوی ناوە، و بە کردەوەش "رووسووریی" عیبادەت "[٥٨]،[٥٩]ی وەدەستهێناوە، چونکە ئا ئەوەتا عیشق کردوویەتی بە "خاشاک - پووش"، و بەو بە خاشاک بوونەش، بە کردەوە بۆتە خۆراکی ئاگر. ئەم بە "ئاگر" بوونە لە جەوهەریدا مەعنا و بەها "نرخ" بەخشینە بە پووش، کە لە زمانی کوردیدا بە "بێ نرخ" ناو دەبرێ: "لە پووش بێ نرختره". هەر ئەو نرخ پێبەخشین "ڕێز بۆ دانان"ە بۆتە مایەی ئەوەی بەو پووشە بگوترێ "شوعلە -

بلێسە". ئا لەم قۆناغەدایە کە مرۆڤ بۆی هەیە ببێتە ئەو "عەصا"یەی دەستی پێبگیرێ.

هەر لە درێژەی ئەوەی کە "ئاگر - شوعلە" و "عەصا" و "دەست" سێ موعجیزەن، پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکرێ کە لە خودی قورئانی پیرۆزدا بە هیچ شێوەیەك وشەی "موعجیزە" بەکارنەهێنراوە، بەڵکو لەجێی ئەوەدا هەردوو وشەی: "آیة":

**وأدخِلْ يدكَ فِي جيبِك تخرج بيضاءَ مِن غَير سوءٍ فِي تِسع آياتٍ إِلى فِرعونَ وقَومِهِ إِنّهم كانوا قَوما فَاسِقِ / النمل ١٢)** و " بُرهان ": **اسلُك يدكَ فِي جيبِك تخرج بيضاءَ مِن غَير سوءٍ واضمم إِلَيك جناحك مِن الرّهبِ فَذَانِك برهانان مِن ربِّك إِلى فِرعونَ وملَئِهِ إِنّهم كانوا قَوما فَاسِقِ / القصص ٣٢** بەکارهێنراون، کە هەردوو وشەکەش مەعنای "بەڵگە" دەبەخشن. لە ئەدەبیاتی صۆفیگەریدا مرۆڤ خۆیشی بەڵگە " آیة "یە، و پاڵپشتی ئەمەش لە قورئانی پیرۆزدا بەدی دەکرێ: **ومِن آياتِهِ أنْ خلَقَكُم مِن ترابٍ ثُمّ إِذَا أَنتم بشر تنتشِرونَ/ الروم ٢٠** ، تەنانەت جیاوازی زمانەکانیش هەر " آیة - بەڵگە"یە: **ومِن آياتِهِ خلْق السّماواتِ والْأَرضِ واختِلَاف أَلْسِنتِكُم وأَلْوانِكُم إِنّ فِي ذَلِك لَآياتٍ لِلْعالِمِ / الروم ٢٢** ، نەك هەر ئەمەش، نموونەی مرۆڤی تاکیش "حەزرەتی عیسا و مەریەمی دایکی (ع)" هەر بە " آیة " ناو براون: **والّتِي أحصنت فَرجها فَنفَخنا فِيها مِن روحِنا وجعلْناها**

**وابنها آيةً لِلْعالَمِ / الأنبياء ٩١** . لـە ئـەدەبییاتی صـۆفیگەریدا، هــەر بــە هــۆی عیــشقەوە، مرۆڤــ بــە گــەورەترین بەڵگــە "ئایــە" دەزانرێ، بەپێی لێکدانەوەی صۆفییانە بۆ ئایەتی "الاحزاب ٧٢"، کە لەم خوێندنەوەیـەدا بـە وردی باسـی لێوەکـراوە، هـەروەها بـە بەڵگەی: **فَإِذَا سوّيته ونفَخت فِيهِ مِن روحِي فقَعوا له سـاجِدِين / ا جر ٢٩** و **قِيلَ ادخلُوا أبواب جهّنم خالِدِين فِيها فَبِئْس مثْوى الْمتكّبِرِين / الزمر ٧٢** و ئایـەتی (الانبیـاء ٩١) کـە پێـش چـەند دێڕێك بە بەڵگە هێنرایـەوە، و **أفَمن شرح اللّه صدره لِلْإِسلامِ فَهو علَى نورٍ مِن ربّهِ فَويلٌ لِلْقَاسِيةِ قُلُوبهم مِن ذِكْرِ اللّهِ أُولَئِك فِي ضلالٍ مبِينٍ / الزمر ٢٢** ، بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی خوا خۆی بە "نور " ناو بردووە لە ئایەتی: **اللّه نور السّماواتِ والْأرض مثَلُ نـورِهِ كَمِشكَاةٍ فِيها مِصباح الْمِصباح فِي زجاجةٍ الزّجاجةُ كَأنّها كَوكَب درّيّ يوقَد مِن شجرةٍ مباركَةٍ زيتونةٍ لَا شرقِيّةٍ ولَا غَرْبِيّةٍ يكَاد زيتهـا يضِيءُ ولَو لَم تمسسه نار نور علَى نورٍ يهدِي اللّه لِنورِهِ من يـشاءُ ويضرِب اللّه الْأمثَالَ لِلنّاسِ واللّه بِكُلّ شيءٍ علِيم / النور ٣٥** دا. لەم روانگەیەوە نـاتوانرێ بـە ئاسـانی بـەو پایـە ئێجگـار گـەورە و تایبەتەی ئەم بوونەوەرە پەی ببرێت.

دەمێنێتەوە، ئەگەر دووەمین بەشی ئەو دێڕە بەم شـێوەیە بخوێنرێتەوە: "بە خاشاکی دەوت: شوعلە، عەصامە دەستی پـێ

دەگـرم" ئـەوا دەبـێ ئـەو کۆمایـە بـە " و " بـزانین، واتـە: هـەم بلێسەمە بۆ خـۆ گەرمکردنـەوە و رووناکی بەکاریـدەهێنم، و هـەم گۆچانمە بـۆ دەسـت پێوەگـرتن بەکاریـدەهێنم. بەمـەش... جگـە لەوەی نـازانرێ بۆچـی ئـەرکی شـوعلە، وەکـو لـە عەصـادا بـەدی دەکـرێ: "دەسـتی پـێ دەگـرم" دیارینـەکراوە، خـودی ئـەو کۆکردنەوەی "شوعلە" و "عەصا"یەش، بەو شێوەیە، رەنگە زۆر سەرکەوتوو نەیەتە پێشچاو، بە تایبەت کە ئەگـەری بـە موعجـیزە "آیة" ئەژمارکردنی ئەو سێ وشەیە رەچاو بکەین.

ئەوەی هەر لە سەرەتاوە، بۆ ئەم خوێندنەوەیە، سـەبارەت بـە شـێوەی نووسـینەوەی ئـەو دووەمـین بەشـەی ئـەو بەیتـە پێشنیازم کرد، ئەمەیە: **"بە خاشاکی دەوت: شـوعلە - عەصـامە دەستی پـێ دەگـرم"**. بـەپێی ئەمـە هـەردوو وشـەی "شـوعلە" و "عەصا" وشەیەکی لێکدراوی تازە پێکدەهێنن کـە خەسـڵەتەکانی هەردوو وشەکە، لە داهێنانێکی تازەدا، لە خۆیدا چڕدەکاتەوە ئەم داهێنانـە شـێوەی "دەسـت گـرتن"، واتـە "توانـای بەکارهێنانـی دەست پەیداکردن"، یان "شێوەی بەکارهێنانی دەست لا دروسـت بوون" دەڕەخسێنێ. واتە "شوعلە - عەصـا" گۆچـانێکە ئەرکـی گەرمی پێبەخشین و رووناککردنەوەش بە ئەنجام دەگەیەنێ، ئـەو "شوعلە - عەصا"یە بەلای منەوە - بەلای مەعـشووقەوە - ئـەو عاشـقەیە کـە عیـشق کردوویـەتی بـە "خاشـاك"، و بـەمکارەش

ئامادەی کـردووە بـۆ ئـەوەی ببێتـە بابـەتی سروشـتیی سـووتان، واتە: ئامادەی کردووە بۆ فەوتاندنی "خۆیەتی - الانّیّة"ی خـۆی، کە زەمینە خۆشکەرە بۆ توانەوە - الفناء — لە زاتی مەعـشووقدا.

ئەم "شوعلە - عەصا"یە، بە کۆکردنـەوەی ئـەو موعجـیزە - بەڵگـە - یانـە لـە یـەك بۆتـەدا، ئـەو گۆچـانەیە کـە توانـای بـەکارهێنانی دەسـت - دەسـەڵات - ی پـێ پەیـدا دەکـەم. ئـەو دەسەڵات پەیداکردنە لە پابەندی بـە گرێبەسـتی ئـەزەلیی **(ألـستُ بـربِّکم - قـالوا بلـی)**، و هـەڵگرتنی بـاری ئەمانـەتی عیـشق: **(انّـا عرضنا الأمانة...)** و جێبەجێکردنی بڕیاری ئەزەلیی **(و مـا خلقـت الجن و الانس الاّ لیعبدون)** واتە "لیعرفونی"دا رەنگدانەوەی خـۆی دەبینێ.

بەم تێگەیشتنە، لەو بەیتەوە رووبەڕووی مـرۆڤ — عاشـق - ێکی دیکەی تازە دەبینەوە کە مەعشووق بە شێوەیەکی تازە و بۆ مەبەستێکی ئێجگار نائاسایی ئامادەی دەکات.

**کە سـینەی ڕیٚشمی بەو تیغی نازە ئەنجن ئەنجن کـــرد**
**وتی: پەژموردەیـــــە ئەم لالـــەزارە، ئاوی تـــیٚ دەگـرم**

با لە "سـیتەی ڕێـش" وە دەسـت پـێ بکـەین کـە مـەعنای "سنگی بریندار، یـان " سـنگی لەتلـەتکراو" دەبەخـشێ. ئـەوەی زیاتر لە ئەدەبییاتی صۆفیگەریدا بـەدی دەکـرێ زۆر بەکارهێنانـی

وشەی "ســــینە" یان "سنگ"ە وەکو درکە - کنایە - یـەك بـۆ "دڵ"، بەو پێیەی "دڵ" بەرجەستەترین و گرنگترین پێکهاتەیە لە سنگدا، و لە ئەزموونی صۆفیگەریدا "دڵ" چەقی هەموو پرۆسـەی وەدیهێنـانی گۆڕانـی پێویـستە لـە چوارچـێوەی قۆناغـە جـۆر بـە جۆرەکانی ئەزموونەکەدا، و بەو پێیەش گرنگترین بەشی جەستەی مرۆڤیشە. ئەم بۆچوونەش پاڵپشتی خۆی لەو فەرموودەیەدا هەیـە کـە دەڵێ: "لـە جەسـتەدا پارچـە گۆشـتێك هەیـە ئەگـەر بـاش و دروست بێت هەموو جەستەی پێ باش و دروست دەبێـت و ئەگـەر تێکیش بچێت هەموو جەستەی پێ تێك دەچێت، ئەویش دڵە"[(٦٠)].

پێشئەوەی چەند نموونەیـەك لـەبارەی ئەمـەوە لـە شـیعری مەحوی/دا بهێنرێتەوە، پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت کـە، لانـی کەم بەلای ئەم شاعیرەوە، پەیڕەوییەکە لەوەی لە چەندین ئایەتی پیرۆزی قورئاندا هاتووە، لەوانەش: **ونزعنا ما فِي صدورِهم مِـن غِلٍّ تجري مِن تحتِهم الأنهار وقَالُوا الْحمد لِلَّهِ الَّذِي هدانا لِهذَا وما كُنّا لِنهتدِي لَولَا أَنْ هدانا اللّه لَقَد جاءَت رسلُ ربِّنا بِالْحقِّ ونـودوا أَنْ تِلْكُم الْجنّةُ أُورِثْتموها بِما كُنتم تعملُونَ / الاعراف ٤٣ ، إِنَّ الَّذِين يجادِلُونَ فِي آياتِ اللَّهِ بِغيرِ سلْطَانٍ أَتاهم إِنْ فِي صدورِهم إِلَّا كِبر ما هم بِبالِغِيهِ فَاستعِذْ بِاللَّهِ إِنّه هو السّمِيع الْبصِ / غافر ٥٦ ، يا أَيّها النّاس قَد جاءَتكُم موعِظَةٌ مِن ربِّكُم وشِفَاءٌ لِما فِي الصّدورِ وهدى ورحمةٌ لِلْمؤمِنِ / يونس ٥٧ و لَأَنتم أَشدّ رهبـةً فِـي**

**صدورِهِم مِن اللّهِ ذَلِكَ بِأَنَّهم قَوم لَا يفْقَهونَ / ا شر ١٣ .**

ئەم نموونەیانەی لێرەدا هێنراونەتەوە گەلێك لەوە روونترن کە ناچار ببین هەوڵ بدەین ئەو راستییە بسەلمێنین کە وشەی "صدور - سنگەکان" یان تێدا بە مەعنای "قلوب - دڵەکان" بەکارهێنراوە. لە زۆر ئایەت و سوورەتی قورئانی پیرۆزدا ئەم شێوە بەکارهێنانە دووبارەبۆتەوە. لەمەش بەولاوە، و لە چوارچێوەی سپاردنی ئەرکی "سەرچاوەی زانین - مصدر المعرفة" بە " دڵ "، لە ئایەتێکی پیرۆزدا بە روونی ئاماژە بۆ جێگیریی " دڵ " لە سنگدا کراوە: **أَفَلَم يسِ وا فِـي الْـأَرض فَتكُونَ لَهم قُلُوب يعقِلُونَ بِها أَو آذَانٌ يسمعونَ بِها فَإِنَّها لَا تعمـى الْأَبصار ولَكِن تعمى الْقُلُوب الَّتِي فِي الصّدورِ / ا ج ٤٦ .**

بە هەمانشێوە، "مەحوی"، لە چەندین بەیتدا "سینە - سنگ"ی بەو مەعنایەی " دڵ " بەکارهێناوە:

**جگەر کون کە، خوێنی گریە بەردە، سینە هەڵبدڕە**
**نیگاهێ کە، ببینە کاری تیر و نەشتەر و خەنجەر**

ە ر ٨ ل ١٣٢

**مەشغووڵــی " شــەرحی گوڵشەنی راز " م، دەفەرمــوێ**
**سینەم کە شــەرحە شــەرحە دەکاتن بە تیغــی نــاز**

ا ز ٦ ل ١٣٤

**سینە صەد لەت بوو، سەرم صەد داغی سەودا پێوە بوو، چووم**
**عەرضــی حاڵــم کەم، بە ئیســـتیهزاوە دەیوت: چاك و باش**

١ ش ٥ ل ١٥١

هــەر وەکــو لــەو نموونەیانــەی لــە ئایەتــەکانی قورئانــی پیرۆزیشدا هێنرانەوە، ئەمانــە مـشتێکن لـە خـەرواری ئـەو هـەموو نموونەیانەی لـە "دیوانـی مـەحوی"دا بـەدی دەکرێن. شـاعیر لـە چەند بەیتێکیـشدا ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکـات کـە "سـینە" بۆتـە و چوارچێوەی بەخۆوە گرتنی دڵە:

**بــەم هەمــوو تیرەوە، دڵ ســینەمی دی، ئەو شـــێرە**
**لـــەرزی هاتــێ، وتی ئەم بێشــە نەما، نیمـــە مەلاذ**

١ ذ ٤ ل ١١٦

**حەقی بوو دڵ لە کۆیـا ما بە ســـینەی ئێمـــە ناراضی**
**کە عاصی قەصری خولدی دی بەجێ ئەڵحەد نەما راضی**

٦ ی ١ ل ٣٠٤

لە هــەردوو نموونــەدا، وێـڕای سـەلماندنی ئـەوەی "سـینە" بۆتەی " دڵ "ە، بەلاّم ئامـاژەیەکی ئێجگار گرنگیشیان تێدا بـەدی دەکرێ یۆ ئەوەی " دڵ " لە ژێـر کـارتێکردنی گـەورەی عیـشقدا، کاروبـارو جڵـەوی بـە دەسـتی خۆیـەوە نامێنێـت و ناچـار دەبـێ

نیشتمانی بناغەیی خۆی، کە "سینە - سنگ"ە، بەجێبهێڵێت و بە پیر داخوازیی عیشقەکەیەوە بچێ بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکانی، هەرچییەك بن و لە هەر کوێ بن.

ئەوەی لە بەیتی "١ ذ ٤ ل ١١٦" دا بەدیی دەکەین ئەوەیە کە: سەرەڕای ئەوەی هەر "سینە" بە نیشتمانی " دڵ " دانراوە (دڵ بە "شێر" ناوبراوە و "سینە"ش بە "بێشە - لانەی شێر")، بەڵام برینە زۆرەکە - جێی ئەو هەموو تیرە - هەر بەسەر سینەوەیە نەك دڵ، بۆیە کە " دڵ " ئەو بێشە - لانە - یەی خۆی بەو شێوەیە دی.. ئاستی ئەوماڵوێرانییە گەورەیەی بۆ دەرکەوت، ناچار بوو ئەو ماڵ - وێرانە -یە بەجێبێڵێ. کەواتە ئەم "سینە"یەی لێرەدا لە " دڵ " جیاکراوەتەوە، بەڵام قەوارە - نیشتمان - ی ئەو دڵەیە، دەبێ چ جۆرە "سینە" یەك بێت!؟، و بە چ جۆرە " تیر "ێك و بۆچی ئاوەها بەو زۆرییە پێکراوە!؟

ناکرێ تیرەکان هی "عیشق" بن، چونکە ئەوجۆرە تیرانە راستەوخۆ ئاڕاستەی " دڵ " دەکرێن، واتە ئەگەر بۆ "بە ئامانجی ئەو جۆرە تیرانە بوون" ناوی "سینە - سنگ"یش بهێنرێ ئەوا مەبەست هەر " دڵ "ە. ئەوەی لە رێوڕەسمی صۆفیگەریدا روو لە جەستەی فیزیکی دەکات - نەك لە لەتیفەیەکی نوورانی وەکو دڵ - تیرە ژەهراوییەکانی ئارەزووخوازی و دنیاپەرستییە. "مەحوی" هەرگیز "دنیاخوازی - دنیاپەرستی" ی بە "ئازایەتی"

دانــەناوە، بــەڵكو پــەيڕەويكردن لــە عيــشق، كــە لــە جەوهــەرى راستەقينەيدا پشتگوێخستنى دنيايە، ئازايەتييە:

**لە پىٚ حەرامە زڕەى سيلسيلەى موقەددەسى عيشق**
**ببـى بـە شـــێر و مەگـەر هەڵگـرى لە دنيـــا دەست**

٥ ت ٦ ل ٧٠

**لە دنيـا تێپەڕى هەركەس، بە باڵى هيممەت، ئازايە**
**لە عوقباش ئەو كەســە گەر تێپـەڕى، بازێكە ئازاتر**

٣ ر ٦ ل ١٢٦

لێرەوەيــە هــەر شــتێك، لــەم ئەزموونــە ئێجگــار جيــاواز و تايبەتــەى عيــشقى حەقيقيــدا، نــاوى تايبــەتى خــۆى و پێــوەرى جيـاوازى خـۆى هەيـە، و ئەگـەر وا نـەبىٚ، ئـەوا دەبـىٚ دڵنيـا بـين لەوەى جۆرە ناڕاستگۆييەك لە ئارادايە:

**هەر دڵىٚ پێوە نەبىٚ داغ و خەطى جىٚ دەمى تێــغ**
**دەعوييـى عيشقى ببىٚ، دەعوييە بىٚ مۆر و سەنەد**

٢ د ٢ ل ١١٢

لە سـايەى ئـەم هەلومەرجـەدا، ئـەو دڵـەى كـە خـۆى بـەوە بزانـىٚ سـەنتەرى عيـشقە و لـە نێـو قووڵاييـدا تـەنها دەبـىٚ جێـى مەعشووق ببێتەوە.. ئەو دڵـە، بـەو هيممەتـە ئێجگـار گەورەيـەوە نــاكرىٚ خــۆى بخاتــە داوى بــىٚ هيممەتييــەوە و لــە "وێرانــە"ى

"سـینە"یـەکی بـە تـیری دنیـاخوازی و ئـارەزووخوازی تـەنراودا بمێنێتەوە:

**"مەحویا" بازێکی تۆ قودس ئاشیان بوونە بوومـی شوومی ئەم وێرانە بۆچ "**

١ چ ١١ ل ٩٧

ئەو جۆرە سینەیەش کە "دڵـی بـە عیـشق ئـاوەدان" جێـی تێدا نەبێتەوە و ناچـار بێـت بـەرەو مەعـشووق کـۆچ بکـات، بـارە بەسەر ئەو دڵەوە بۆیە:

**چـۆڵی دی سـینەم لـە دڵ، بـۆ سـووتنی ئـەمری دا، شـێری نەبیٚ ئەم لانە بۆچ ؟**

١ چ ٤ ل ٩٦

کەواتە "سینەی رێش" دڵی بە کاریگەریی عیـشق برینـدارە لـەم حەوتـەمین بەیتـەی غـەزەلی " ٤ م " داو، ئـا ئـەم لایەنەشـی کارێکی ئەوتۆ دەکات، کە وەکو سەرەتاگە، یەکەمین هەنگاوی لـە لایەن مەعشووقەوە، پەسەند بکرێت و ئەوەش، بە کردەوە – نـەك سـەرزارەکی و سـەرپێیی – رابگەیەنـدرێت. دەرەنجـام، ئـەم پەسەندکردنە وەرچەرخانێکی گەورەیە لە عاشقدا بەو ئاڕاستەیەی بە شێوەیەکی سەیر ئامادە بکرێت بـۆ ئـەوەی بتوانـیٚ ئەرکەکانـی عیشقەکەی جێبەجیٚ بکات.

پێشئەوەی بێینەسەر ئەمجۆرە ئامادە و تەرخانکردنەی عاشق بۆ عیشقەکەی، کە جۆری هەرە باوی ئامادەکردنە، پێویستە ئامارە بۆ ئەوە بکەم کە ئەمەش یەکێکە لە لوتفە گەورەکانی مەعشووق: ئەو لوتفە.. ئەو ئامادەکردنە خودی "مەحوی" ناوی "ئەنجن ئەنجن کردنی سینە" ی لێدەنێ، لە ئەدەبیاتی صۆفیگەریشدا دەیان ناوی وەکو: کردنەوە - فتح -، چاوکردنەوە، دڵکردنەوە، چاوی دڵ و... تاد، ی بەدی دەکرێن، سەرجەمی ئەو ناوانەش ئامارە بۆ پەیداکردنی توانایەکی دیکەی بیناییکردن "روانین، سەیرکردن" دەکەن:

**خودا بیدا بە رەحمەت، داغی دڵ چاوی دڵــە مەحوی**
**بە گریە چاو ئەگەر چوو، شك دەبەم چاوێکی بیناتر**
٣ ر ٩ ل ١٢٧

**دڵ لە ئیدراکی حەقیقەت بێ بەشە بێ داغی عیشق**
**"مەحویا" دانا دەبێ بەم چاوە بینایی بکا**
٦ أ ٩ ل ١٩

ئەمانەی مەحوی ناوی " چاو " ی لێ ناون و سەرچاوەکەشی یان "داغی دڵ"ە یان "داغی عیشق" تەنها باس لە لایەنە مەعریفییەکە دەکەن، بەڵام مەبەستی شاعیر لە تێکرای غەزەلی " ٤ ی "دا لایەنە ئەخلاقییەکەیە. پێشتر لە "سینەی

ڕێش"دا، لەو سینەیەدا کە بە داغی عیشق بریندارکراوە، ئاماژەی بۆ ئەمە کرد، بێ ئەوەی ئاوڕ لەو لایەنە مەعریفییە بداتەوە، وا ئێستا قۆناغێکی دیکە دەست پێدەکات: وا یار - مەعشووق - بە "تێغی ناز" ئەو "سینە ڕێش"ەی "ئەنجن ئەنجن" کردووە و هۆکاری ئەو کارەشی روونکردۆتەوە: "**وتی پەژموردەیە...**"..
ئەمەیان مژدەی سەرکەوتنێکی گەورەترە، جۆرە زایەڵەیەکی بەیتێکی دیکەی مەحوییە:

**کە تێغت دڵ دەکا دوو لەت، دەدا تەبشیری "قد أفلح"**
**دەنووسێتن لە صەفحەی سینە تەفسیری "ألم نشرح"**

٢ ح ١ ل ١٠٣

بابەتی مژدانەکەش: "تەبشیری قد افلح"، سەرەڕای ڕێزی زۆرم بۆ مامۆستایانی بەشدار بوو لە لێکدانەوەی دیوان، ئاماژە نییە بۆ ئایەتی: **قَد أفْلَح الْمؤمِنـونَ / ا ؤمنـون ١** و زۆریش لێیەوە دوورە، بەڵکو ئاماژەیە بۆ ئایەتی: **قَد أفْلَح من تزكّـى / الاعلى ١٤** ، یان ئایەتی: **قَد أفْلَح من زكّاها / الـشمس ٩** ، کە وشەی "تزکی" مەعنای "خۆی خاوێنکردەوە"، و وشەی "زکاها" ش مەعنای "خاوێنی کردەوە" واتە "ناخی - نەفسی - خۆی خاوێن کردەوە دەبەخشێ. لە ئەدەبییاتی صۆفیگەریشدا "خاوێن کردنەوەی ناخ - تزكية النفس" بناغەی ئەو ئەزموونە و

ڕێگەی ڕاستەقینەی سەرکەوتنی کۆششی هەر صۆفییەکە. جگە لەم پاڵپشتە، کە یەکێکە لە بنەما هەرە سەرەکییەکانی صۆفیگەری، لە هەموو قۆناغێکدا هەمان گرنگیی هەیە و بەردەوامە، ئاماژە کردن بۆ "تەفسیری (ألم نشرح)" لە نیوەی دووەمی ئەو بەیتەدا، پاڵپشتێکی گەورەتر دەخاتەڕوو بۆ ئەو ڕاستییەی کە "مژدەی سەرکەوتن"ەکە بۆ "خاوێن کردنەوەی دەروون - ناخ" دەگەڕێتەوە.

"ألم نشرح"یش ئاماژەکەی زۆر ڕوونە چونکە لە قورئانی پیرۆزدا تەنها یەکجار بەو شێوەیە هاتووە: **ألم نشرح لك صدرك / الشرح ١** ، و وشەی "شرح"یش، لە زمانی عەرەبیدا هەم مەعنای "فراوانکردن" دەبەخشێت و هەم مەعنای "لەتلەتکردن" دەگەیەنێ. وشەی "تشریح"ی عەرەبی لە بواری پزیشکیدا - ئەناتۆمی -، واتە لەتلەتکردنی لەشی مردوو، لەو ڕەگەوە وەرگیراوە. وەکو لێکدانەوەکەی مامۆستایان ئاماژەی بۆ کردووە، و لە سەرجەمی بەیتەکەشدا دەردەکەوێ، مەحوی مەبەستی لەو کردنەوەیە "کردنەوە و شارەزاکردنی دڵ لە ڕێی ڕاست"ە، کە یەکێکە لەو خاڵانەی لە ئەزموونی صۆفیگەریدا ئاماژەی بۆ دەکرێت، و بە یەکێك لەو تایبەتمەندییانەی پێغەمبەری ئیسلام (ص) دادەنرێت کە خوا، بە بێ داخوازیکردن، پێیبەخشیوە، واتە: "ئایا سنگمان نەکردیتەوە - فراوان نەکردیت

- بۆ ڕێگای ڕاست ؟"، کەچی پێغەمبەرێکی، تەنانەت وەکو حەزرەتی مووساش (ع) کە بە "کەلیم - قسە لەگەڵ خوا کردوو" ناسراوە، ناچار خۆی لە خوا پاڕایەوە سنگی بکاتەوە: **قَالَ ربِّ اشرح لِي صدرِي / طه ٢٥ .**

هەڵبەتە "مەحوی" دڵنیایە لەوەی کە ئەو "ألم نشرح"ەی زمانی گفتوگۆی مەعشووق بوو لەگەڵ گەورەترین خۆشەویستی لە نێو مرۆڤایەتی و سەرجەمی بوونەوەرانیشدا، ناکرێ ببێتە زمانی گفتوگۆ لەگەڵ عاشقێکی تازەکاری وەکو ئەو، بۆیە ناچار، و تەنانەت بە پەنا بردنەبەر خۆشەویستیی کەلیم، حەزەتی مووسا (ع) - لای خوا، لە دوا بەیتی هەمان ئەو غەزەلەدا، هەر ئەو پاڕانەوەیە دووبارەبکاتەوە:

**دڵی "مەحوی" لە سینەی تەنگیا هەر ما بە دڵ تەنگی**
**بە جاهی مووسەوی بۆ مەش، وەکو بۆ ئەو بوو، "ربِّ اشرح"**
٢ ح ٧ ل ١٠٤

ئامرازی لەتکردن "ئەنجن ئەنجن"کردنی سینەی عاشق، لەلایەن مەعشووقەوە، "تێغی ناز"ە. تێغ/یش، بە شێوەیەکی سروشتی هەر ئەرکی بڕین "لەتلەتکردن" ئەنجامدەدات. کە "تێغ" بدرێتە پاڵ "ناز"ەوە، لانی کەم، پەیوەندیی موڵکایەتی دێتەئاراوە، موڵک هی خاوەنەکەیەتی و بۆ ئەو مەبەستە بەکاریدەهێنێ کە بڕیاری لێداوە. "ناز" دەسەڵاتی مەعشووقە،

بـەلاّم ئـەو دەسـەلاّتەی کـە نـە دەتوانـرێ بەربەسـتی لەبەردەمـدا دابنرێ، و نـە کـەس بـۆی هەیـە بپرسـێ: بۆچـی؟ ئـەو دەسـەلاّتە رەتناکرێتەوە چونکە:

**کـە ئـەمری فـەرموو ئـەو شـاهە بـە " إقـرأ " ئەگـەر فەرمانـی قەتڵە، کێ دەڵێ نەء**

١٦ أ ١ ل ٤٠

نەك هەر ناشتوانرێ بەربەست لەبـەردەم ئـەو دەسـەلاّتەدا دابنرێ، بەڵکو کەوتنەبەر کاریگەریی ئـەو دەسـەلاّتەش پێویستی بە رەزامەندی و مۆڵەت پێدانی خاوەن دەسەلاّت هەیە:

**چ یارایــە، بە بێ ئیمایــی ئەبــرۆ ســـەیری ئەو چاوە حەرامە مەیکەشی لەم مەیکەدە بێ روخصەتی حاجیب**

٦ ب ٢ ل ٥٣

ئـەو دەسـەلاّتە بڕیـاری تایبـەتی خـۆی هەیـە و کـردەوەی لەسەر بنیاد دەنرێ، نەك هەر عاشق، کەس بۆی نییە لە هۆی ئەو کردەوانە بپرسێ:

**جەمالت حەیفە دەرخەی بۆ کەس و ناکەس، وتـم، فەرمووی: جەلالی حوسـنە ئێمــەی کردە شـاهەنشـاهی (لا یُســـــأل)**

٤ ل ٢ ل ٢٠٩

ئەو دەسەلأتەی ئەو نموونانەی بۆ هێنرایەوە -واتە ناز- دەتوانرێ، بە شێوەیەکی گشتی دژ بە پلانی تۆکمە و باش داڕێژراوی خەڵکانێك بێت کە پێشتر خۆیان بۆ کارێکی دژ بە ویستی مەعشووق ئامادەکرد بێت، وەکو ئەو پلانەی بۆ کوشتنی حەزرەتی عیسا (ع) بوو و بە پلانێکی تۆکمەتر پووچەڵکرایەوە: **ومكروا ومكر اللّه واللّه خير الْماكِرين / آل عمران٦٩** ، یان ئەو پلانەی بۆ پێغەمبەر (ص) داڕێژرا بوو کە بگیردرێ یان بە یەك لێدانی بە کۆمەڵ بکوژرێ یان دەربکرێ: **وإِذْ يمكُر بِك الّذِين كفَروا لِيثْبِتوك أَو يقْتلُوك أَو يخرِجوك ويمكُرونَ ويمكُر اللّه واللّه خير الْماكِرين / الانفال ٣٠** . ئەو دەسەلأتەش هەر ئاڕاستەیەکی هەبێت یان بە هەر ئاقارێکدا بڕوات ناتوانرێ بەربەستی لەبەردەمدا دابنرێ: **وإِنْ يمسسك اللّه بِضرٍّ فَلَا كاشِف لَه إِلّا هو وإِنْ يرِدك بِخيرٍ فَلَا رادّ لِفَضلِهِ يصِيب بِهِ من يشاءُ مِن عِبادِهِ وهو الْغفُور الرّحِيم / يونس ١٠٧** . لە هەموو حاڵتێکیشدا، و بەپێی مەنتیقی ناوەوەی ئەزموونی صۆفیگەری، ناکرێ لە عیشقی حەقیقیدا پتر لە یەك مەعشووق هەبێت، چونکە عیشقەکە درۆزنانە دەردەچێ. خودی عاشقیش دەبێ دڵسۆزانە بۆ سەرخستنی عیشقەکەی هەموو خۆیەتیی خۆی بەخت بکات، بۆیە کردەوەی مەعشووق ناخرێتە بەر پرسیار و گومان و هەرجۆرە پرۆتستۆیەکەوە: **لَو كانَ فِيهِما آلِهةٌ إِلّا اللّه لَفَسدتا فَسبحانَ اللّهِ ربِّ الْعرش عمّا**

**يصِفُونَ (٢٢) لَا يسأَلُ عمّا يفْعلُ وهم يـسألُونَ / الانبيـا ٢٢ و ٢٣** . لە راستیـشدا مەسـەلەی هـەرە گرنگـی ئـەم پەیوەندییـەی نێوان مەعشووق و عاشـق بـەجێهێنانی پابەنـدی و بەجێگەیاندنـی ئەمانەتێکـە پێـشتر ئاماژەیـان بـۆ کـرا. باشـترین شـێوەی ئـەو بەجێهێنان و بەجێگەیاندنە راستگۆییە لە خۆشەویـستیدا.. ورتـر، راستگۆییە لەگەڵ "خۆ - خـود" لـە بـەجێهێنانی رێوڕەسمەکانـی عیشق بە کردەوە. لە دوو بەیتی ورد دا هاتووە:

**تعصي الإله و أنت تُظهر حُبّه هذا، لعمـري، في القياس بديـع**
**لو كان حبُّكَ صادقـاً لأطعتَه إنّ المُحبَّ لمـن يُحبُّ مُطيع** [٦١]

تـەنها لـەم حاڵەتـەدا.. لـە سـایەی بوونـی ئـەوجۆرە خۆشەویـستییە لـە "سـینە"دا، دەتوانـرێ بـاس لـەوە بکـرێ کـە ئامادەیـە بـۆ "لـەتکردن"، بـەلام سـەرەڕای ئـەوەش.. سـەرەڕای ئەوەی هەنگاوی جیددی هەڵهێنراوە بۆ خاوێنکردنەوەی سـینە لـە هـەموو شـتێکی دیکـەی غـەیری "یـار"، پێدەچـێ تـازە تـازە گۆڕانکـاریی راسـتەقینە لـە قۆنـاغی دروسـتبووندا بێـت، و ئـەو گۆڕانکارییـەش خـاوەنی ئەزموونەکـە بـۆ قۆنـاغێکی نـوێ ئامـادە بکات. مەعشووق " یار " کە "سینەی رێش" ی عاشقی بە "تێغی ناز" "ئەنجن ئەنجن کرد" لە خۆڕا نـەبوو.. ئـەو سـینەیە "زەویـی

بەیار" بوو و دەبوو "بکێڵرێ".. زەوییەکی ئەوتۆ بوو کە دەبوو بە گوڵی "لالە"ی عیشق هێندە دەمبکاتەوە کە بە تەواوی دایبپۆشێ. ، بەڵام مەعشووق بە کزی و وشکی دیویەتی: "وتی پەژموردەیە ئەم لالەزارە".. ئەم گوڵزارە هێندە بێ ئاوە تینوویەتی بڕست "تاقەت"ی لە گوڵەکانی بڕیوە و سیسیکردوون، گوڵی عیشقی حەقیقی/یش بۆ ئەوە دروستنەکراون بە بێنازی ئەو ئاوە بمێننەوە و تەڕ و پاراو نەبن، بۆ ئەوە نەکراون لە ژێر کاریگەریی خراپی نەبوونی "بنەماکانی گەش و رەونەقداربوون"دا بژاکێن.. با پێوەرەکان جیا بن، بەڵام راستییەك لەم بوارەدا هەیە نابێ نکووڵیی لێ بکرێت و نادیدە بگیرێ، ئەویش ئەوەیە کە خودی ولات - هەرێم - ی ئەوجۆرە خۆشەویستییە "ئیقلیمی عیشق" بەوە ناسراوە کە جێگەیەکی پڕ ئاو و هەوایە:

**گریە دەجۆشێ لەوێ، ئاهە: نابێ بسرەوێ**
**نەمدی وەك ئیقلیمی عیشق جێگە بە ئاب ە هەوا**

١٤ أ ٤ ل ٣٧

لە بنەڕەتیشدا دەتوانرێ ئاماژە بۆ ئەوە بکرێ کە بنەماکانی سەرخستنی ئەزموونی صۆفیگەرانە، کە گریان و رەنج و دەرد و برینن و.... تاد، دەبنەمایەی پێکەوەنانی گوڵزار، یان هەر شتێکی دیکە، کە لە جیهانی فیزیکیدا بۆ خۆشی بەکاردێن:

**بە گریانم، وەکو گوڵ، پێکەنی یار لە باغی من، بە بارش، غونچە پشکووت**

١٠ ت ٢ ل ٨٠

**گوڵ و لالـــەی کەژ و کۆ، کۆهکـەن دێنێتـــەوە فکـــرم**
**کە خوونی ناحەقی ئەو مەوج ئەدا ئێستەش لە کێو و شاخ**

١ خ ٣ ل ١٠٥

ئەم وەرچەرخانە گەورە و بێ سنوورەی مەعنا لەنێوان هەردوو جیهاندا (جیهانی ئەزموونی صۆفیگەری و جیهانی فیزیکی) تەنها لە سایەی گەورەیی و بێ پایانیی دەسەڵاتی عیشقەوەیە، ئەو عیشقەی کە بەڵگەی تایبەتمەندیی خۆی هەیە:

**دڵ هــەر بە داغــی عیشـــقە ئەگـەر ئیمتیـــازی بێ**
**وەك نوقطە ی ئینتیخابە لەسەر شیعری مونتەخەب**

٣ ب ٤ ل ٤٧

هەر ئەو "داغ"ە مۆری پەسەندیی "کارنامەی عیشق"ی عاشقە، و لەو رۆژەدا کە پێویستە هەڵوێستی راستەقینە بسەلمێنرێ، دەتوانێ رووسووری و راستگۆیی پێ بسەلمێنێ:

**بە ناخوون صوورەتی یارم لە صەفحەی سـینە نووسیوە**
**لە حەشرا وەقتی نەشری نامە کردن، منـم و سـیپارەم**
٩ م ٤ ل ٢٢٩

**لالە روخسـارم لە سـایەی ئەشکی خوێنین رەنگـەوە**
**چونکە روو سوورم لە قاپیی عەین و شـین و قاف و تێ**
١٥ ی ٤ ل ٣٢٣

بـە گەڕانـەوە بـۆ لای **"وتـی پەژموردەیـە ئـەم لالـەزارە"**، سـەرنجی ئـەوە دەدرێ کـە گۆڕانێـك، یـان دوورکەوتنەوەیـەك لـە رەوتـی ئاسـایی بـەدی دەکرێـت: حاڵـەتی سروشـتیی "لالـەزار" ئەوەیە گەشاوە و پاراو بێت. بە رواڵەت، رەنگە لێرەدا هەمان ئەو "لادان"ە بەدی بکرێ کە لە چوارەمین بەیتی ئەم غەزەلەدا بـەدی کرا: **"بە ناوی سێوی ناوم باغەوان و من بەهێ دەگرم"**، بەڵام لـە لێـچواندنی ئـەو دوو حاڵەتـەدا جـۆرە ناحـەقی، و لـە روانگـەی ئەزموونەکـەوە، جـۆرە سـتەمێکی گـەورەش بـەدی دەکـرێ. لـە یەکەمین حاڵەتدا گۆڕانەکە لە "سێو" ەوە بۆ "بەهێ" گۆڕانـە لـە "ناسنامەی بناغەیی بوون"دا بە ئاڕاستەی شێواندنی تـەواوی ئـەو ناسنامەیە، ئەمەش لە پەیوەندیی نێوان "رووسـووریی عیبـادەت" و "رووزەردیـی خەجاڵـەت"دا بـە تـەواوی رووندەبێتـەوە. بـە شـێوەیەکی روونـتر، ئـەم حاڵەتـە دەرەنجـامی رەفتـارە بـە

پێـچەوانەی ئـەوەی پێویـستە، بـا لـە چوارچـێوەی چـاودێریی خۆکردن، بەخۆداچوونەوە و گومـانی خـراپ لـە خۆکردنـی عاشـق بێـت. غـەزەلی (٥ م) ی مـەحوی، بـە تـەواوی، لـەم خولگەیـەدا دەسـووڕێتەوە، ئـەو خولگەیـەی، بـە رواڵـەت، دەتوانـرێ بـە "خولگەی گلەیی لە خیانەتکردن لە بوون" لەقەڵەم بدرێ:

**لە ناکەس کارییـا، خاکـم بەسـەر، رۆیی بە بـا عومـرم**
**خودا، تۆ بمژییێنـە تا لەبـەر قاپیـی کەسـێ دەمـرم**

د ٥ م ١ ل ٢٢٠

رەفتـاری مرۆڤـ لـەم خولگەیـەدا، لـە روانگـەی سـەودا تایبەتییەکانی ئەزموونی صۆفیگەرییەوە، هێندە نابەجێیە کە نەك تەنها خەڵکی دیکە، بەڵکو خاوەن رەفتاریش نـاتوانێ نکووڵـیی لێ بکات:

**لە پێ کەوتووم و نەفسم بۆ هەوا دەشـنێ وەکو منـداڵ**
**لەبـەر پیری سـەرم خۆی ناگرێت و تازە پێ دەگـرم**

٥ م ٥ ل ٢٢١

دەرەنجامەکەش ئەوەیـە کـە خـاوەن رەفتارەکـە خـۆی بـە شـایانی ئـەوە نـازانێ لـە بـستە خاکێکیـشدا بـە خـاك بـسپێردرێ چونکە ئەوە سزایەکە بۆ ئەو شوێنە، کە سکالای هەڵبـژاردنی دژی قەبرهەڵکەن بەرزدەکاتەوە، یان لەگـەڵ کەسـانێکدا حەشـر بکـرێ

نەبا ئەوانیش بەر ئەو نەفرەتە بکەون کە ئەم بەریکەوتووە:

**چییە سووچ و گوناهی ؟ بۆچی دەیکاتە جەزاخانە**
**لە قەبرھەڵکەن هەتا رۆژی جەزا دەعواچییە قەبرم**
**سبەینێ " یُحشَرُ المرء " ە، براگەل فرسەتە ئەمڕۆ**
**تەبەڕرا بن لە من با کەس نەبێ حەشری لەگەڵ حەشرم**

٥ م ٦ و ٧ ل ٢٢١

لە دووەمین حاڵەتدا مەسەلەکە جیاوازە، لێرەدا تەنها جۆرە فەرامۆشکردنێکی کاتی لە ئارادایە و عاشق بەخۆداچۆتەوە و لێی قەبووڵکراوە، بەڵگەی لێ قەبووڵکردنەمە ئەوەیە کە مەعشووق - یار - ئاوڕی لێ داوەتەوە، و ئەوەتا بە "تێغی ناز" سینەی "ئەنجن ئەنجن دەکات. بەمەش، عاشق "خوا پێداوە" و "بەر رەحمەتی یار کەوتووە":

**بە تیر ئەمڕۆ دڕی وا هەرچی پێش هات خودا پێداوە هەر کەس بەر نەظەر کەوت**

١٣ ت ٦ ل ٨٨

**بڕۆی ئەو شۆخە ئەمڕۆ تێغی کێشا نەجاتی دا بە رەحمەت هەرچی بەرکەوت**

١٣ ت ١٠ ل ٨٩

دەرەنجامی ئـەو "بـە تێغـی نـاز ئـەنجن ئـەنجن کـردن"ەی "سینە"ش ئاشکرایە: "ئاو تێگرتن - ئاوڕشێنکردن" ی "لالەزاری پەژموردە - سیس و وشك".. واتـە بووژاندنـەوەی ئـەو لالـەزارە. ئەمە خاڵێکی ئێجگار گرنگی تێدا بەدی دەکرێ کە پەیوەنـدیی بـە "ئاوی راستەقینە" و "سەراب"ەوە هەیە:

**بە ئاوی تێگەیشتین ئێمــــە دنیـــا، هـەر ســـەرابێ بوو**
**هەمـوو دەشچن بە خنکان و لە وشکییشـە مەلەی مەخاووق**
٢ ق ٦ ل ١٨٢

کە دڵنیا بین لەوەی دەیبینین سەرابە، نەك ئـاو، رووی تـێ ناکەین، بەلاّم شاعیر، نەك هەر پشت لەو دنیا - سـەرابە دەکـات، بەڵکو "ئاوی نەمری"شی مەبەست نییە:

**(خضر) ئەگەر چاوی حەیاتی بڕییـە ئـاوی حەیـــات**
**من لـە خاکـــی دەری جانانەمــە هـــەر چاوی حەیـــات**
٣ ت ١ ل ٦٣

پاساوی ئـەوەش لەوەدایـە کـە ئـەزموونی عیـشق بـاس لـە جـۆرە "ژیان - حەیات"ێکـی دیکـە دەکـات کـە "ئـاوی حـەیات" شـەرم دەکات لە بەرانبەریدا خۆی بنوێنێ:

**ون بـووه لــەو رۆژەوە لێـــوی حەیات ئەفــزاتی دی**
**وا دەبیٚ شــەرم و حەیـا، ئەی ئافەرین، ئاوی حەیات**

١ ت ٢ ل ٥٦

ئەو ژیانە لە "خۆتواندنەوە" لـە زاتـی یـاردا چڕدەبێتەوە، تواندنەوەی بوونێکـی سـەرپێیی و ناپایـەدار، بـەو مەبەسـتەی لـە ئاوەدانیی مانەوەی هەمیشەیی یاردا، عاشق بتوانـیٚ جێـی پێیـەك بۆ خۆی وەدەست بێنێت و لە کۆت و بەندی دنیا رزگاری ببیٚ:

**بەڵکە لـەو رێیــەوە من پــەی بەمــە عیمرانــی بەقــــا**
**"مەحویــــا" غەیری خـــەراباتــی فەنــا نیمە مــــەلاذ**

١ ذ ٧ ل ١١٧

ئەم ئاوە راستەقینەیە ئەو ژیانە پایەدارە دابین دەکات، و ئەو "لالەزار" ی سیس "پەژموردە" بووە پێیدەبووژێتەوە، بـەڵام بووژانەوە بۆ چی؟ و لە پێنـاوی چـیدا!؟ لـە پێنـاوی وەدیهێنانـی گۆڕانــی بناغــەیی و خولّقانــدنی عاشــقێکی تــازەی ئــەوتۆ بــە شایستەییەوە لـە ریـزی خـەڵکانی تایبـەت "الخـواص"دا جێگـەی ببێتەوە، بۆ ئەنجامدانی ئەرکی تایبەتی داهاتووی:

**لە پاداشــی قســەی ســەردا هەمە ئاه و هەناســەی گــەرم**
**کەســـیٚ شــێتانە بەردم تیٚ گــریٚ من بەرقــی تیٚ دەگــرم**

پاداش، لە بناغەدا، وەلامی کاری باشی هەر کەسێکە، دەشتوانرێ بە هەڵسەنگاندنی ئەوکارە باشە، بە شێوەیەکی بەجێ و گونجاو، لە قەڵەم بدرێ. لێرەشەوە تایبەتمەندیی گەورەی ئەم بەیتە دەردەکەوێ، چونکە ئەوەی پاداش دەکرێ، لە راستیدا ناتوانرێ کارەکەی بە "کاری باش" ناو ببرێ. ئەگەرچی هەر لە خودی ئەم بەیتدا روونەبێتەوە کە ئەو "لە پاداشی"یە مەعنای "لە وەلامی" دەبەخشێ، سەرەڕای ئەمەش، لە میانەی خوێندنەوەی زۆر وردی بەیتەکەدا ئەو راستییە روونەبێتەوە کە وشەی "پاداش" زۆر بە وردی، زیرەکانە و پڕ بە پێستی مەبەستی بۆ - هەڵبژێردراو، لەو شوێنەدا دانراوە.

"قسەی سەرد" بەرانبەر بە چەند هاوواتایەکی دیکەی وەکو "قسەی بێتام"، "قسەی بێ گیان"، "قسەی نابەجێ و بێ نرخ" بەکاردەهێنرێ. یان بە تەعبیری خودی مەحوی لە شوێنێکی دیکەدا مەعنای "قسەی بێ جا" دەبەخشێ، واتە ئەو قسەیەی هیچ بۆشاییەکی پێویست لە بواری "واتاخوازی"دا پڕ ناکاتەوە، ئەمەش ئەو بەیتەیە:

**چاوە، جێی ئەو شۆخە بێ، وتم، و وتی:**
**ئەم مەلا شێخە قسەی بێ جا دەکا**

٨ أ ٣ ل ٢٣

بە قەرینەی ئەوەی شاعیر وەڵامی بۆ ئەو "قسەی سەرد"ە هەیە، و لە سەرەتاوە بە تەعبیری "لە پاداشی - لە وەڵامی" ئەو راستییەی دەربڕیوە، دەزانین ئەو "قسەی سەرد"ە دەبێ قسەیەك بێت بە مەبەستی سووكایەتی پێكردن و شكاندنەوە ئاڕاستەی ئەو كرا بێت، واتە ئەو "پاداش"ە بۆ شت - مەسەلە - یەك دانراوە كە لە ناخەوە تیری كوشندەی ئاڕاستەی خاڵێكی ئێجگار گرنگ دەكات: "هەستی مرۆڤ"، واتە ئەو شوێن - بەش -ەی مرۆڤ كە پتر لە هەموو شوێن - بەش -ەكانی دیكەی مرۆڤ بە هەستیارییەوە دەكەوێتەژێر كاریگەریی ئەو گۆڕانكارییانەوە كە راستەوخۆ لە دەمارگیرییەوە هەڵدەقووڵێن. ئەو گۆڕانكارییانەی خێرا، كوتوپڕ، بەهێز، چاوەڕواننەكراو و كۆنترۆڵنەكراویشن. ئایا دەكرێ پاداش ئەم خەسڵەتانەی هەبێت؟

نەخێر، كێشەكەش لێرەدا كێشەی هەڵچوون و وەڵامدانەوەی خراپە بە خراپەی یەكسان، یان گەورەتر نییە، بەڵكو كێشەی بەهایەكی ئەوتۆیە كە ناكرێ بە هۆی رەفتارێك یان چەندین رەفتاری دووبارە بووەوەی نابەجێوە ئەو بەهایە فەرامۆش بكرێت:

**ئەگەر واعیظ دوو صەد طە عنە بدا، طە عنێكی لێ نادەم**
**ئەگەرچی موستەحەققی لەعنە، با بۆ رافضی بێ سەب**

٤ ب ٤ ل ٥٠

ئەم بەیتە یەکێك نییە لە بەیتەکانی ئەو غەزەلەی ئەم خوێندنەوەیەی بۆ تەرخانکراوە، بەلاّم دەقاودەق ئەو مەعنایەی لە خۆیدا چڕ کردۆتەوە، و بە روونیش دەیدرکێنێ، کە هەشتەمین بەیتی ئەو غەزەلە لە پەناوە، بەلاّم زۆر هونەرمەندانەتر و بە گیانێکی کراوە و لێبوردووانەتر، رایدەگەیەنێ. بۆیە پێویستە هەڵوەستەیەکی گونجاوی لە ئاستدا بکرێ.

"واعیظ - واعظ"، جگە لەوەی مەعنای "ئامۆژگار - ئامۆژگاریکار" دەبەخشێ، زاراوەیەکی ئایینیی خاوەن دەلالەتی ئەخلاقیی ئاشکراشە، کە سەرباری بە دەم ئامۆژگاریکردنی خەڵك، ئەرکی رێبەری و رێنوێنی/شی دەخاتەئەستۆ. ئەوەی لەمجۆرە کەسانە چاوەڕوان دەکرێ ئەوەیە کە بە کردەوە پەیڕەوی لە رەوشتی بەرز بکەن، و بەلای کەمەوە لە خراپە و گوناهە گەورەکان خۆیان دووربخەنەوە تا بتوانن کاریگەریی پێویستیان بەسەر خەڵکەوە هەبێ. "طە عنە - تانە و تەشەر" لە خەڵکی دانیش یەکێکە لەو رەوشتانەی دەبێ مرۆڤ، بەتایبەت "واعیظ"، کە دەزانێ چ کارێکی خراپ و گوناهێکی گەورەیە، خۆی لێ بە دوور بگرێت، چونکە تانە و تەشەردان لە هەر کەسێك چەندین گوناه لە خۆیدا کۆدەکاتەوە، وەکو گاڵتە بە خەڵکی کردن و ناوزڕاندنیان و لە پاشەملە باسکردنیان، کە لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکاندا بەرپەرچ دراونەتەوە: **یا أَيُّها الَّذِين آمنـوا لـا**

**يسخر قَوم مِن قَومٍ عسى أنْ يكُونوا خيرا مِنهم ولَا نِساءٌ مِن نِـساءٍ عسى أنْ يكُنّ خيرا مِنهنّ ولَا تلْمِزوا أنفُسكُم ولَا تنابزوا بِالْألقَـابِ بِئْس الِاسم الفُسوق بعد الْإِ ان ومن لَم يتب فَأُولَئك هم الظّالِمونَ (١١) يا أيُّها ٱلَّذِين آمنوا اجتِنبوا كَثِ ا مِن الظّنّ إِنّ بعض الظّنّ إِثْـم ولَا تجسّسوا ولَا يغتب بعضكُم بعضا أيحِبّ أحدكُم أنْ يأكُلَ لَحم أخِيهِ ميتا فَكَرِهتموه واتّقُوا اللّه إِنّ اللّه توّاب رحِيم / ا جرات ١١ و ١٢**

ئەنجامدانی ئەو تاوانانـەش، بـە دڵنیـابوون لـەوەی ئاسـایی نـین، سـووربوونە لەسـەر تـاوان، ئەمـەش لـە لایەکـەوە قـەبارەی راستەقینەی تاوانەکە گەورەتر دەکاتەوە، و لە لایەکی دیکەشـەوە خـەڵکانێکی بـە کـردەوە دەسـت لـە دنیـا داشـۆردوو و بـە تەنـگ خەڵکەوە هاتووی وەکو مەحوی، ناتوانن لـەم بـاڵ بەسـەر هـەموو شتێکدا کێشانەی تاریکی، بـە نـاوی رووناکییـەوە، بێـدەنگ بێـت. ئەم هەڵوێستە پاڵ بە "واعیظ"ەوە دەنێ، لە رێگـەی ناوزڕانـدن و تانـە و تەشـەرەوە تۆڵـەی لێ بکاتـەوە، و لەسـەر هەڵخەڵەتاندنـی خۆی و ئەو خەڵکەش هەر بەردەوام دەبێت. لێرەوەیـە رەنـدی بـە کردەوە دەست لە دنیا داشۆردوو و بە تەنگ خەڵکەوە هـاتوو ئـەو چـەکەی "واعیـظ" لـە هـەموو کردەوەکـانی دیکـەی بـە رزیـو و مایەپووچتر دەزانێـت، و لـە بریـی ئـەوەی وەڵامـی بداتـەوە، دڵـی پێیدەسووتێ. لەمەش بەولاوە، وەڵامدانەوە بەو چەکە مایەپووچە

جۆرێکە لە مایەپووچی، بۆیە ئەگەر "واعیظ"، بە گوتەی خودی شاعیر: "دووسەد جاریش ئەو چەکە بەکاربێنێ - دوصەد طعنەم لێ بدا"، ئەم تاقە جارێکیش هەر بەکاریناهێنێ. لە کرۆکی راستەقینەی مەسەلەکەشدا شاعیر پێیوایە "واعیظ" خیانەتی لە مانای بوونی خۆی کردووە، چونکە ئەوەی لە گەوهەری دڵیدایە، بە خۆڕایی و زۆر نەزانانە بە "دنیا"ی بەخشی:

**گەر تێ بگەن لە گەوهەری دڵدا چ مەوج ئەدا**
**ئەم شەوچراغە لەم شەوەدا کەس دەدا بە کەس**

٢ س ١٠ ل ١٤٨

بەڵام ئەو، نەك بە کەسی دیکە، بەڵکە بە خودی ئەو شەوەی بەخشی کە دنیایە، چونکە ئەگەر "شەو" نەبایە پەنا نەدەبردرا بۆ "شەوچراغ"، و بەمەش لە "گۆڕستانی رووناکیی راستەقینە"دا ئەو شەوچراغەی بە خاکسپارد، بۆیە نەك هەر شایانی تانە و تەشەرەیە، بەڵکو شایانی نەفرەت لێکردنیشە "موستەحەققی لەعنە"، بەڵام ئەم خۆی بەو دەردەی ئەو نابات و ئەو "گەوهەرەی دڵ" نادۆڕێنێت.. ئەو گەوهەرەی مرۆڤی پێ دەبێتە مرۆڤی راستەقینە، و کارێکی ئەوتۆ دەکات بە هیچ شێوەیەك دەست لە مرۆڤایەتیی خۆی هەڵنەگرێت و خیانەتی لێ نەکات.

ئەو "طه عن"ەی لەو بەیتەدا ئاماژەی بۆ کراوە، هەمان ئەو "قسەی سەرد"ەیە کە لە هەشتەمین بەیتی ئەم غەزەلەدا ئەو شوێنەی گرتۆتەوە، یان شێوەیەکە لە شێوەکانی قسەی سەرد. بەڵام پێشئەوەی درێژە بەمە بدەین باشترە وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە: ئایا ئەوەی بەر "طه عنە" ی "واعیظ" کەوتووە، بۆی هەیە بە هەمانشێوە وەڵامی بداتەوە!؟

لە خودی بەیتەکەدا ئەوە روونکراوەتەوە کە بە هۆی سووربوونی "واعیظ"ەوە لەسەر خیانەتکردنی لەوەی "لە گەوهەری دڵ"دایە، شایانی "نەفرەت لێ کردن"ە، نەك تەنها "تانە و تەشەرە"، ئەمەش لە چەند دێڕی پێشوودا روون کراوەتەوە. لە قورئانی پیرۆزیشدا هەر کەسە مافی خۆیەتی وەڵامی هەر دەستدرێژییەك بۆ سەری، بە هەمانشێوە، بداتەوە:

**وكتبنا عليهم فيها أنّ النّفس بالنّفس والعين بالعين والأنف بالأنف والأذُنَ بالأذُن والسِّنّ بالسِّنّ والجروح قِصاص فَمن تصدّق بِهِ فَهو كفّارةٌ له ومن لم يحكُم بِما أنزلَ اللّه فَأولِئك هم الظّالمونَ / المائدة ٤٥** و **وإنْ عاقبتم فَعاقِبوا بِمِثْل ما عوقبتم بِهِ ولِئن صبرتم لَهو خير لِلصّابِرين / النحل ١٢٦** ، لە هەردوو ئایەتی بە بەڵگە هێنراودا، دەستهەڵگرتن - واز هێنان - لە وەڵامدانەوەی خراپە بە خراپە، لە لایەن ئەو کەسەوە کە دەستدرێژیی بەسەرداکراوە، باشترە، واتە ئەگەرچی مافی خۆیەتی بە هەمانشێوە و ئاست

وەلأمی دەستدرێژی بداتــەوە، بــەلأم بــێ دەنگــی و وەلأمنەدانــەوە باشترە. لە ئایەتی دیکەدا، لەمەش زیاتر، مرۆڤـ هـان دەدرێـت بـۆ ئەوەی بە "چاکە - چاکترین شێوە" وەلأمی "خراپە" بدرێتـەوە، وەکـو: **ادفَع بِالَّتِي هِي أحسن السَّيِّئَةَ نحن أعلَم بِمـا يـصِفُونَ / المؤمنون ٩٦** و **ولَا تستوِي الْحسنةُ ولَا السَّيِّئَةُ ادفَع بِالَّتِي هِـي أحسن فَإِذَا الَّذِي بينك وبينه عداوةٌ كَأَنَّه ولِيٌّ حمِيـم / فـصلت ٣٤** ، بە کردەوەش، لە فەتحی مەککـەدا فـەرمان ئـەوە بـوو بـە خراپــە وەلأمــی خراپــەکانی رابــوردوو نەدرێتــەوە، تەنانــەت هــی ئەوانەش کە رێی خواپەرســــتییان لێ گرتبــوون. لــە ســــوورەتی "المائدة"دا دوو جار داوای چاوپۆشــــی لە وەلأمدانەوەی خراپــەی موشریکەکان کراوە: **يا أَيها الَّذِين آمنوا لَا تحِلُّوا شعائِر اللَّهِ ولَـا الشَّهر الْحرام ولَا الْهدي ولَا الْقَلَائِد ولَا آمِّين الْبيت الْحرام يبتغونَ فَضلًا مِن ربِّهِم ورِضوانا وإِذَا حلَلْتم فَاصطَادوا ولَا يجرِمنَّكُم شنآنُ قَومٍ أَنْ صدّوكُم عنِ الْمسجِدِ الْحرامِ أَنْ تعتدوا وتعاونوا علَى الْبِـرِّ والتَّقْوى ولَا تعاونوا علَى الْإِثْمِ والْعدوانِ واتَّقُوا اللَّه إِنَّ اللَّه شـدِيد الْعِقَابِ / المائدة ٢** و **يا أَيها الَّذِين آمنوا كُونـوا قَـوّامِين لِلَّـهِ شهداءَ بِالْقِسطِ ولَا يجرِمنَّكُم شنآنُ قَومٍ علَى أَلَّا تعدِلُوا اعدِلُوا هـو أَقْرب لِلتَّقْوى واتَّقُوا اللَّه إِنَّ اللَّه خبِير بِما تعملُونَ / المائـدة ٨** ، مژدەی بەهەشتیش، بەو بەرینییەی، بــە دەقــی ئایــەت، بــە چــەند کۆمــەڵێکی خــەڵك دراوە کــە ئەمانــە لــە ریزەکــانی پێــشەوەدان:

**الّذين ينفِقُونَ فِي السّرّاءِ والضّرّاءِ والْكَاظِمِ الغيظَ والعافِ عن النّاسِ واللّه يحِبّ المحسِنِ / آل عمران ١٣٤** ، بەڵام بنەمای هەرە بەهێز و سەرەکیی "مەحوی"، لە ئەزموونی صۆفیگەریدا بەدی دەکرێت، لەو "گەوهەر"ەی کە لە " دڵ "دا مەوج ددەدات، وەکو لە بەیتی " ٢ س ١٠ " دا ئاماژەی بۆ کراوە. ئەو گەوهەرە، بە ئاماژەی هەردوو ئایەتی: **اللّه نور السّماواتِ والأرض مثَلُ نورِهِ كَمِشكَاةٍ فِيها مِصباح الْمِصباح فِي زجاجةٍ الزّجاجةُ كَأَنّها كَوكَب درّيّ يوقَد مِن شجرةٍ مباركَةٍ زيتونةٍ لَا شرقِيّةٍ ولَا غَربِيّةٍ يكَاد زيتها يضِيءُ ولَو لَم تمسسه نار نور علَى نورٍ يهدِي اللّه لِنورِهِ من يشاءُ ويضرِب اللّه الْأَمثَالَ لِلنّاسِ واللّه بِكُلّ شيءٍ علِيم / النور ٣٥** و **فَإِذَا سوّيته ونفَخت فِيهِ مِن روحِي فَقَعوا لَه ساجِدِين. / الحجر ٢٩** و **قِيلَ ادخلُوا أَبواب جهنّم خالِدِين فِيها فَبِئْس مثْوى الْمتكَبِّرِين / الزمر ٧٢** ، هەر ئەو ڕووناکییەیە کە مرۆڤی پێ خەڵاتکرا و ڕێزی لێنرا بەو شێوەیەی ئایەتی: **ولَقَد كَرّمنا بنِي آدم وحملْناهم فِي البرّ والبحرِ ورزقْناهم مِن الطّيِّباتِ وفَضّلْناهم علَى كَثِيرٍ مِمّن خلَقْنا تفْضِيلًا / الاسراء ٧٠** ، جەختی لەسەر دەکات. صۆفییەکان، لەمەش بەولاوە، پشت بە قسەیەك دەبەستن، کە بە فەرموودە – حەدیث – لە قەڵەم دراوە و دەڵێ: "قلب المؤمن عرش الرحمن"(٦٢).مەحوی لەم بەتەدا، زۆر بە ڕوونی و ڕاشکاوی، ئەو مەعنایە دووپاتدەکاتەوە کە لەوێدا مەبەستە:

**دڵــە عەرشی خودا " مەحوی "، خەجاڵــەت بە لەبـەر غەفڵــەت**
**کـە بۆتـــە بوتکــــەدەی بێ بەرهەمــــەن یا دەیـــری بێ راهیب**

٦ ب ٧ ل ٥٥

کەواتــە ئــەو "رووناکییــەی خــودا" یـان بــەلای کەمــەوە، رەنگدانەوەی ئەو رووناکییە، ئەو "گەوهەر"ەیـە کـە لـە " دڵ "دا مەوج دەدات و "واعیظ"، بەو شێوەیە، هەرزانفرۆشی دەکات و بێ بەرانبەر دەیبەخشێ، و لەمەش خراپتر، بە تانـە و تەشـەردان لـەو کەسانەی دەیانەوێ رێ لـەو بێئاگـایی "غەفڵـەت"ەی ئـەو بگـرن، پـتر خیانـەت لـەو بوونـەوەرە رێـز لێـنراوەی خـاوەن ئـەو "دڵ"ە تایبەتە دەکات، "واعیظ"، ئەگەرچی ناوەکـەی ئاماژە بـۆ جـۆرە "زانـابوون"ێـك دەکـات، پێدەچـێ لــە نـاخی خۆیـدا، نــەزان و ناتێگەیشتوو بێت، ئەگینا:

**تێگەیــوو شـیوەنیە ئەمـــڕۆ، دا ســـــبەی شـایی بکا**
**پێگەیــوو دەروێشە، دا سوبحەی شــەهەنشـــایی بکا**
**نووری عومری صـەرف ئەکا بۆ کەشفی تاریکی لە خەڵق**
**وەك چـــرا، هــەر کەس بە شـــۆخی مەجلیس ئارایی بکا**

٦ أ ١و ٢ ل ١٦

ئەمە گەوهەری مەسـەلەکەیە: رووناکیی ژیـان – تەمـەن – بەکارهێنان بۆ لابردنی تاریکی لەسـەر ئـەو خەڵکـە و لـە ناخیـان، ئەمە تێگەیشتن و پێگەیشتنە بەرانبەر بە نـەزانی و کـرچ و کاڵیـی

"واعیظ". دانا، لە یەکەمین قۆناغدا دەرك بەو رووناکییە دەکات و دەیناسێتەوە، و دەرەنجام بەو ئاڕاستەیە بەکاریدێنێ کە پێیوایە، بۆ خەڵکی نەك خۆی، بەجێ و سوودبەخشە. ئەمە رەنگدانەوەی ئایەتی " الاسراء ٧٠ " یە: **ولَقَد كَرّمنا بِني آدم وحملْناهم فِـي الْبِرّ والْبحرِ ورزقْناهم مِن الطّيِّباتِ وفَضّلْناهم على كَثِـ ٍ مِمّن خلَقْنا تفْضِيلًا** ، هەروەها زیاتر رەنگدانەوەی ئایەتی: **يا أَيّها النّاس إِنّا خلَقْناكُم مِن ذَكَرٍ وأُنثَى وجعلْناكُم شـعوبا وقَبائِـلَ لِتعـارفُوا إِنّ أَكْرمكُم عِند اللّهِ أَتقَاكُم إِنّ اللّه علِيم خبِ  /ا جـرات ١٣** ، و ئەو فەرموودانەیە کە جەخت لەسەر یەکسانی دەکەن[٦٣]، و ئەوەی دەدرێتە پاڵ حەزرەتی مەسیح (ع) کە "مرۆڤ بە" بونیادی خوا لە زەویدا " لە قەڵەم دەدات و "نەفرەت" لەو کەسە دەکات کە ئەو بونیادە دەڕووخێنێت. تێگەیشتنی ئەم مەسەلەیە، لە روانگەی مەحوییەوە، جۆرە داناییەکی دووربینانەیە کە "ئێستا"ی تێدا دەبێتە هەوێنی بەرهەمهێنانی داهاتوو:

**تۆوی سەرخستووە بن خاکە، سەرئەفرازیی بەر**
**هەر لە رێگەی طه لەبا بوو سەری دانا، دانا**

١٢ أ ٦ ل ٣٥

ئەوەی بە وردی لە بەیتی (٦ أ ٢)دا راگەیەندراوە دەخرێتە نێو چوارچێوەی گشتییەوە، هەر لەو چواچێوەیەدا مەحوی رەخنە لە خۆی دەگرێ بەوەی:

**لە حەفتا تێپەڕیـــم و حەفتـــەیەك بۆ دین و بۆ دنیـــا**
**بە کاری خـۆم و کاری کەس نەهاتـــم، وەی چ بێکارەم**

٩ م ٢ ل ٢٢٩

لەم بازنە فراوانەش دوو بازنەی تەسکتر هەیە، بازنەیەکی مامناوەندی کە یاران دەگرێتەوە، و دەکرێ مەبەست لەو وشەیە هەموو موسوڵمانان بێت، بە گشتی، یان یارانی تەریقەت، یان یارانی پێغەمبەر (ص)، واتە ئەسحابەکان و.... تاد، لە هێڵە گشتییەکەی ئەم بازنەیەدا جۆرە پەیوەندی و وابەستەییەکی لەگەڵ ئەم بازنەیەدا بەدی دەکرێ:

**لە کن من ئەصـــلی نیـــە و نەبووە عەیشـــی تەنهـا خۆش**
**نیـــە بەهەشـــتی دنیـــــا هـــەم بە بێ ئەحیببـــا خۆش**

١ ش ١ ل ١٥٢

بنەمای بازنە فراوانەکە - ئیمانداران، موسوڵمانان -، دەکرێ لە چەندین دەقی قورئانی پیرۆزدا بەدی بکرێ، وەکو:

**واعتصموا بحبل اللهِ جميعا ولا تفرّقوا واذكُروا نعمت اللّهِ عليكُم إذْ كُنتم أعداءً فألّف بين قُلوبكُم فأصبحتم بنعمتهِ إخوانا وكُنتم على شفَا حفْرةٍ مِن النّارِ فأنقذَكُم منها كذَلك يبيِّن اللّه لكُم آياتِه لعلّكُم تهتدونَ / آل عمران ١٠٣** ، و **إنّما المؤمنونَ إخوةٌ فأصلحوا بين أخويكُم واتّقُوا اللّه لعلّكُم ترحمونَ / الحجرات ١٠** ، لە فەرموودەکانی پێغەمبەریشدا (ص) چەندین بنەما

بــەدی دەكــرێ، لەوانــە: "نموونــەی بــاوەڕداران لــە یەكــدی خۆشویستن و بەزەیی بە یەكدی هاتنەوە و هاوسۆزییان نموونـەی یـەك جەسـتەیە كـە ئەگـەر ئەنـدامێكی ئـازاری هـەبوو ئەندامانـی دیكەی بە بێداری و تا پاڵپـشتیی دەكـەن"(٦٤)، و "بـاوەڕداران بـۆ یەك وەكو بینا – خـانوو – ئاوەهـان، هـەر بەشـێكی ئـەوی دیكـە قـایم دەكـات"(٦٥)، و چـەندین فـەرموودەی دیكـەش. سـەبارەت بەوەی پەیوەندیی بە یارانی پێغـەمبەرەوە (ص) هەیـە، پاڵپـشتیی گەورەی لە چەندین دەق و فەرموودەدا هەیە كـە ئـەم دوو ئایەتـە بەرجەستەترینیانن: ﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنصُرُونَ اللَّـهَ وَرَسُـولَهُ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ (٨) وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِـمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُـوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْـسِهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ الحشر ٨ و ٩ . هێنـدەی پەیوەنـدیی بـە "یـارانی تـەریقـەت – مـەحرەمانی راز – هـاوڕازان"یـشەوە هەیـە، ئەوا خودی ئەزموونی صۆفیگەری، و گەورەیی ئـەو رازەی كۆیـان دەكاتـەوە، و ئـەو ئەمانەتـەی "عیـشق" كـە خۆیـان خـستۆتەژێر باریەوە، و هاوڕێتیان لە رێگەی ئێجگار سـەخت و گرنگـی عیـشقدا كۆمەڵـە پابەندییـەكیان دەخەنـە ئەسـتۆوە، كـە خۆشەویـستیی یەكــدیی بنیــات نــراو لەســەر هــاوڕازیی پشتئەســتوور بــە

خۆشەویستیی "یار - مەعشووق" یەکێکە لەو پابەندییە گرنگانە. مەحوی ئەو تەریقەتە بە "تەریقەتی عیشق" ناودەبات:

**رێگـــەی هودا طه ریقـــەتی عیشـقە، دە "مەحویــــا"**
**وەرن و پیــــا بڕۆن و (وصـــــلوا علـــی الرســـــول)**

٣ ل ٨ ل ٢٠٨

مەعنای "تەریقەت"یش لـە سنووری تەسکی پابەندی بـە رێبــازێکی دیــاریکراوی وەکــو صــۆفیگەری، یــان یــەکێك لــە تەریقەتەکانی، دووردەخاتەوە و دەیکاتە رێبازێکی گشتیی ئەوتـۆ کە تەنانەت، بەلای شاعیرەوە، یارانی پێغەمبەریش (ص) پابەندی بوون:

**هــەر ئەم طه ریقـە[٦٦]بوو بـە هەمــوو صەحبی گرتیـان**
**رۆییــن پیـا، هەتـا گەینـــە مەرتەبـەی وصــــوول**

٣ ل ٩ ل ٢٠٨

لە بەرانبەر ئەم حاڵەتە گشتییانەدا، کە تێکڕای خەڵك، یـان گرووپێکی دیاریکراویان، بەپێی رێبازی عیشق، خۆش دەویسترێن و تاریکییــان لەســەر لا دەبرێــت، بــەلای مەحوییــەوە خزمەتــی تاکەکەسیش سـەرمایەیەکی ئێجگـار گەورەیـە، بـەڵام خزمـەتی چ کەسێك و بە چ شێوەیەك؟

**دەپرســـن: کیمیـا؟ خدمـــەت بە مـەرد، ئەمما بە ئیخلاصـی**
**وەگەرنا، کەم لە (بووبەکر)ی نەبوو خدمەت (ئەبوو طالب)**[٦٧]
**٦ ب ٣ ل ٥٣**

ئاماژەی ئەو بەیتە بۆ "مەرد" روونە، و ئـەوەی پێویســـتە بگوتـرێ ئەوەیـە کـە لـە ئەدەبییـــاتی صۆفیگــــەریدا پێغەمبـەر (ص) بــە "گەوهــەری یەکدانــە – دوڕدانــە – الجوهــر الفــرد" و "مرۆڤــی تــەواو – الانـسان الکامـل"[٦٨] و چــەندین نـاوی دیکـەی ئاوەها ناو براوە.

ئــەم پایەیــەی مرۆڤــ و بــەکارهێنانی روونـاکیی ژیـان بـە مەبەستی لابردنی تاریکی لەسـەر خـەڵك، لـە "جیهـانی ئەزموونـی عیشقی حەقیقی" دا بەرانیـەرێکی بـە تـەواوی جیـاوازی هەیـە لـە جیهانی ئاسایی "جیهانی فیزیکـی"دا، ئەگەرچـی شـانۆی هـەردوو بۆچــوون و رەفتــارە جیاوازەکـە هــەمان شـانۆیە کـە "جیهانــە فیزیکی" یەکەیە. هەر لـەم جیهانـەدا وێنـە هاودژەکـان، پێکـەوە، دێنەسەر شانۆ:

**دڵ لەت دەبێ کـە هـەر دوو جگـەر گۆشــەی ئادەمــــن**
**قابیلـــــە ئەشـــقیایە، (ابو الانبیـــا) یە شـــــــیث**
ا ث ٤ ل ٩١

**واعیـــظ، لە من، بڵێ، بە نەظـــەر طـەعنـە بەس بــدا**
**<u>دینی بتانـــە</u> دینـــی من، ئـــەو مەذهـــەبی ذەهـــەب**

٣ ب ٥ ل ٤٨

لـە بەرانبـەری "مـەذهـەبی ذەهـەب"ی "واعیـظ"دا "دینـی بتـان" بـە دیـنی خـۆی دەزانــێ. "بـت"یـش لـە ئەدەبییاتــی صۆفیگەریدا، وەکو چەندین وشەی دیکەی هاوشێوەی "جانانـە"، "هیندوو"، "تـورك" و.... تـاد، نیـشانەیە بـۆ مەعـشووق "یـار"، بەمەش "دینی بتان" هەرهەمان "تەریقەتی عیشق"ە کـە پێـشتر، لە بەیتی (٣ ل ٨) دا بـە "رێگـەی هـودا – هیدایـەت" نـاوی بـرد، کەواتە "مەذهەبی ذەهەب"یـش دەبـێ "رێگـەی گومڕایـی" بێـت، بەڵام هێشتا زووە بۆ ئەمە. دەشـکرێ مەبەسـت لـە"دیـنی بتـان" "دیتـنی بتـان – بینیـنی بتـان" بێـت و بەمـەش مەعناکـە بـەو شێوەیەی لێ دێتەوە کـە "دیـنی مـن بریتییـە لـە بینیـنی بتـان – مەعشووق –، کـە دەرەنجـام مـەعنای "وردبوونـەوە لـە ئایـەت – موعجـیزە – کـانی مەعـشووق" دەبەخـشێت، و ئەمـەش لـەم خوێندنەوەیەدا روونکراوەتەوە.

مەحوی نایەوێ ئاوەها سەرپێیی و خێـرا بەسـەر شـتەکاندا بڕوات، ئەو "تانە و تەشەر"ەی ئامۆژگار، کە پێشتر لـە بـەیتی (٤ ب ٤) دا ئاوڕی لێ دایەوە، تەنها خیانەت نییە لـەو بوونـەوەرە رێـز لێـنراوەی نـاوی "مرۆڤــ" ی لێـنراوە یـان ئـەو "دڵ"ەی کـە بـە

"شەوچراغ" زانراوە، بەڵکو پێش هەموو ئەمانەش خیانەتە لە چەمکی جەوهەریی بوون، کە خودی شاعیر ناوی "سەرنویشتی ئەزەل - چارەنووسی ئەزەلی" ی لێناوە:

**واعیظ لە رەندی مەیکەدە دەگرێ کە ئیعتیراض**
**راضی نیە بە سەرنویشتی ئەزەل: " انني لراض "[٦٩]**

١ ض ١ ل ١٥٦

واتە خیانەت لە خود لە جەوهەریترین پابەندیدا کە عیشقە.. ئەو عیشقەی تاقە رێگەی پاراستنی "شەوچراغ" و "رووناکی" ی "دڵ"ە، و هەمیشە مرۆڤ بەو پابەندییە بەو "جامەی ئەلەست" دەگاتە مەستیی عیشق و مەعشووقێکی بێ هاوتا، لە هەمانکاتیشدا خیانەتە لە بڕیاری ئەزەلیی مەعشووقیش. لێرەوە دەتوانین دڵنیا بین لەوەی هەرجۆرە بەرپەرچدانەوەیەکی ئەو بڕیارە ئەزەلییە ناکرێ لە وریاییەوە هەڵقوڵا بێت، و بەمەش ئامۆژگار شایانی نەفرەت لێکردنە - موستەحەققی لەعنە -، بەڵام ئەم ئەوکارە ناکات. لە تێگەیشتنی ئەم راستییەوە کە عیشق بینینی کردەوەکانی مەعشووقە و سەرسامییە لە ئاستیاندا، نەك ئاوڕدانەوە لەو کردەوانەی رەنگدانەوەی ویستی ناڕاستەوخۆی مەعشووقن، مەحوی داوای بەخۆداچوونەوەیەکی دیکە و تیڕوانینێکی قووڵتر دەکات:

**نەقشی خودا ببینـــە، لە خەڵقـــی خودا گـــــــەڕێ**
**گــەر ئەهلــی ئیحتیـــــرازی لە کەس مەگــرە ئیعتیراض**

١ ض ٦ ل ١٥٧

واعیظ، بەم زەمینە خراپەی لە خۆ و خەڵقی گەیشتن "طـە عنـــە" دەدات و "ئیعتـــیراض" دەگرێــت و "قـــسەی ســـەرد"ی هــەڵقوولاو لـە دەرکنـەکردن بـە بـەهای مرۆڤــ، ڕووبـەڕووی مـرۆڤـ دەکاتــەوە، بـە تایبــەت مرۆڤـی عاشـق، ئایـا ئـەویش دەکـرێ بــە هەمانـشێوە وەڵامـی بداتـەوە ! ؟ مـەنتیقی ئـەزموونی عیـشق ئـەم جـۆرە کاردانەوەیـــە ڕەتدەکاتـــەوە، چـونکە عاشـــق دەخاتـە داوی ئەو هەڵە گەورەیانــــەوە کە بە خیانەت لە بەها.

**خواجــەی ســـەرحەڵقەی بەزمەکـــەی "ألـــست " دەمـــاخ وە نەشئەی بادەی (فەنا) مەست**

دیوانی مەولەوی ٢ر٣ ل ٢٧٤

دەشکرێ ئاماژە بێت بۆ چەند ئایەتێکی وەکو "المائدة ٣ و ١١٩"، "التوبة ١٠٠"، "الفتح ١٨"، "المجادلة ٢٢" و...تاد.

بناغەییـەکانی لـە قەڵـەم داون، کـە بـە بـەها و پابەندیـی ڕاستەقینەی مرۆڤی زانیون. واتـە بـە "سـەرد" وەڵامـی "سـەرد" ناداتەوە، کەواتە "گـەرم" بـە وەڵام دەزانـێ... بـۆ؟ لەبەرئـەوەی کاریگــەرترە و ئـــەم کاریگەرییەشـــی لـــەوەوە هـــاتووە کـــە لـــە جەوهەریدا کاردانەوە نییە، بەڵکو وەڵامدانەوەی کارێکی خراپە بە

خۆپاراستن لە هەر جۆرە کارێك:

**هەناسەی ئاگرینم بردەوە بەر، تا دورروونم سووت**
**بە ناڵە تا دڵت سەخڵەت نەدەم، بڕوانە چۆنم بۆت**

٨ ت ٤ ل ٧٧

ئەمە نەك تەنها وەلامدانەوە نییە، بەڵکو هەوڵێکی ئێجگار جیددی و زۆر سەختە بەو ئاڕاستەیەی تەنانەت ڕەنگدانەوەی ئەو "ئاه"ە ئاگرینەش بشارێتەوە بە مەبەستی ئازارنەدانی بەرانبەر، با نرخی ئەوکارەشی ئەوە بێت کە خۆی لەناخەوە بسووتیٚ. ئەگەرچی ئەم ئاهە ئاگرینە، لەم شوێنەدا، کاردانەوە نییە، واتە "واعیظ" و خراپەکارییەکانی لە ئارادانین، بەلاّم وەکو لە بەیتی ( ٤ م ٨) دا بە روونی دیارە، خاوەنی "قسەی سەرد"ەکە دەستنیشاننەکراوە، چونکە پێدەچیٚ شاعیر نەیەویٚ ناوی بزڕێنیٚ، و لە بەیتە هاوشێوەکانیشدا، کە نموونەی هێندێکیان هێنراوەتەوە، تەنها وشەی "واعیظ" بەکارهێنراوە کە کۆمەڵە خەڵکانێکی هاوپیشە دەگرێتەوە، بە گشتی، بیٚ ئەوەی کەسێکی دیاریکراو بگرێتەوە و ناوی بزڕێنیٚ، ئەمەش لە جەوهەری مەسەلەکەوە، واتە لە بەرز و بەرێزڕاگرتنی مرۆڤ و بەها تایبەتەکانییەوە هەڵدەقوولێت و نموونەیەکی زیندووی پیادەکردنی ئەو بۆچوونەیە.

**"لە پاداشی قسەی سەردا هەمە ئاه و هەناسەی گەرم"،**

ئەگەرچی ئەو وشەی "**هەمە**"یە مەرج نییە ئەوە بگەیەنێ کە بە تەواوی، لەو "**ئاه و هەناسەی گەرم**"ە بەلاوە هیچی دیکەی نییە، بەڵام راگەیاندنی، بەلای کەمەوە، ئەوە دووپاتدەکاتەوە کە **هیچ** یەکێك لەو توانایانەی لە "**پاداشی قسەی سەرد**"دا بەکارناهێنێ. ئەمەش، بە کردەوە ئەوە دەگەیەنێ کە خۆبەخشانە دەست لە بەکارهێنانی "قسەی سەرد" بەرانبەر بە "قسەی سەرد" هەڵدەگرێ بەو مەبەستەی، لە لایەکەوە، خۆی لەو رەوشتە دووربخاتەوە، و لە لایەکی دیکەشەوە سنوورێك بۆ بەکارهێنانی دابنێ لە رێگەی "نەورروژاندن و برەونەدان بە کاردانەوە - دژە کردار -ەوە. ئەگەرچی ئەوجۆرە دانبەخۆداگرتنەش ئێجگار سەختە و کاری زۆر گەورەشی دەکاتەسەر، و لە نێو کۆمەڵیشدا کەس ناتونێ، لە چوارچێوەی سروشتیی خۆیدا، لەو ددانبەخۆداگرتنە تێ بگات. ئەم خراپ تێگەیشتنەش دەبێتە مایەی خەمێکی دیکە:

**غەمم دێتێ کە بۆ وەك کۆدەك ئاگر بەردەمە کاغەز**
**لە بۆ نووسینی غەمنامەی دلم هەر گا قەڵەم دادەم**

٨ م ٢ ل ٢٢٧

بەڵام خودی ئەو "ئاه"ە وەڵامێکی تایبەتە و کاریگەرییەکی ئێجگار گەورەی هەیە. ئەو ئاهە، رێك لەوکات و شوێنەدا کە خاوەنەکەی توانایەکی باشی وەڵامدانەوەی هەیە، و

مافی تەواوی هەیە لە وەڵامدانەوەدا، بەڵام خۆبەخشانە چاوی لێدەپۆشێ، تەنها بۆ ئەوەی رێگە لە تەشەنەکردن و پەرەسەندنی خراپە بگرێ، لە دوو رووەوە کاریگەریی گەورەی دەبێ: لەو رووەوە کە نووزەی کەسێکی ستەملێکراوە، و لەو رووەشەوە کە ستە بە ستەم، لەم شوێنەدا، وەڵامنەدراوەتەوە. کاریگەریی ستەملێکراو بوون لە چەندین ئایەتی پرۆزدا هاتووە، لەوانە ئەگەر ستەمەکە کوشتن بێت: **مِن أجلِ ذَلِكَ كَتبنا علَى بني إسرائيلَ أنَّه من قَتلَ نفْساً بغيرِ نفْسٍ أو فَسادٍ في الأرضِ فَكَأنَّما قَتلَ النّاسَ جمِيعاً ومن أحياها فَكَأنَّما أحيا النّاسَ جمِيعاً ولَقَد جاءَتهم رسلُنا بالبيِّناتِ ثُمَّ إنَّ كثيراً منهم بعد ذَلِكَ في الأرضِ لَمسرِفُونَ / المائدة ٣٢** ، ئەگەر ستەم لە "هەتیو – یتیم" بکرێت: **إنَّ الَّذِين يأكُلُونَ أموالَ اليتامى ظُلْماً إنَّما يأكُلُونَ في بطُونهم ناراً وسيصلَونَ سعِيراً / النساء ١٠** ، و ئەگەر ستەمی بوختانکردنی پیاو بۆ ژنەکەی بێت: **والَّذِين يرمونَ أزواجهم ولَم يكُن لَهم شهداءُ إلّا أنفُسهم فَشهادةُ أحدِهِم أربع شهاداتٍ باللَّهِ إنَّه لَمِن الصّادِقِين (٦) والْخامِسةُ أنَّ لَعنت اللَّهِ عليهِ إنْ كانَ مِن الْكاذِبِين / النور ٦ و ٧** ، ئەگەر ستەم لە خۆکردن و بەزاندنی سنووری خواش بێت ئەوا: **ومِن النّاسِ من يتَّخِذُ مِن دونِ اللَّهِ أنداداً يحِبّونهم كَحبِّ اللَّهِ والَّذِين آمنوا أشدُّ حبّاً لِلَّهِ ولَو يرى الَّذِين ظَلَموا إذْ يرونَ الْعذَاب أنَّ الْقُوَّةَ لِلَّهِ جمِيعاً**

**وأَنَّ اللَّه شـديد الْعـذَابِ / البقـرة ١٦٥** . لـه قورئانـدا ئـەو کەسانەش فەرامۆش نەکراون کە بە دەرنەبڕینی ناڕەزایی بەرانبەر ستەمی خەڵکانی دیکە ستەم لە خۆیـان دەکـەن: **ولَا تركَنوا إِلَى الَّذِين ظَلَموا فَتمسَّكُم النَّار وما لَكُم مِن دونِ اللَّهِ مِن أَولِياءَ ثُمَّ لَـا تنصرونَ / هود ١١٣** . دەرەنجامی ستەمیش زۆر سەختە: **ولَو أَنَّ لِكُلِّ نفْسٍ ظَلَمت ما فِي الْأَرضِ لَافْتدت بِهِ وأَسرّوا النَّدامةَ لَمَّـا رأَوا الْعذَاب وقُضِي بينهم بِالْقِسطِ وهم لَا يظْلَمونَ / يونس ٥٤** .

جێـی سـەرنجە کـە یـەکێك لـەو خاڵانـەی خـوای گـەورە پێیخۆش نییە بەندەکانی بیکەن ئەوەیـە کـە بـە راشـکاوی بەنـدە نیازی خراپی خۆی رابگەیەنێت، بەڵام ئەوەش هەر بۆ کەسێك کـە ستەمی لێکرا بێت، رێگـەی پێـدراوە: **لَا يحِبّ اللَّه الْجهر بِالسّوءِ مِن الْقَولِ إِلَّا من ظُلِم وكَانَ اللَّه سمِيعا علِيما / النـساء ١٤٨** . سـەرەڕای ئـەو رەگـە قووڵـەی سـتەمکردن لای مـرۆڤ، بـەڵام لـە لایەکەوە خوای گەورە نایەوێ ستەم لە بەندەکان بکـات: **مثَلُ ما ينفِقُونَ فِي هذِهِ الْحياةِ الدّنيا كَمثَلِ رِيحٍ فِيها صِرٌّ أَصابت حرثَ قَومٍ ظَلَموا أَنفُسهم فَأَهلَكَته وما ظَلَمهم اللَّه ولَكِن أَنفُسهم يظْلِمونَ/آل عمران١١٧** ، و بە لێبوردەییەوە مامەڵە لەگەڵ بەنـدە دەکـات: **ويستعجِلُونك بِالسَّيِّئَةِ قَبلَ الْحسنةِ وقَد خلَت مِن قَبلِهم الْمثُلَات**

**وإنّ ربّك لذُو مغفِرةٍ لِلنّاس على ظُلمِهم وإنّ ربّك لشدِيد العِقاب/ الرعد ٦**

له فەرموودەكانی پێغەمبەردا (ص) دوعای ستەم لێكراو گیرایە، و یەكێكە لەو پاڕانەوانەی وەڵامدەدرێنەوە[٧٠]، و دەگاتە دەرگای خوا[٧١] بێ ئەوەی پەردەیان لە نێواندا هەبێت[٧٢]، بۆیە دەبێ لێیبترسین[٧٣]. خودی مەحویش لە چەند شوێنێكدا ئاماژەی بۆ ئەمە كردووە، وەكو:

**بە كەم مەگرە سروشك و ئاه و ناڵەی بێ نەوایانت**
**كە سەیلی بێ ئەمانە، تیری دلدۆزە، گولەی وەروەر**

٥ ر ٢ ل ١٣٠

**با زۆری بێ، بە كەم مەگرە ئاهی بێ كەسان**
**بەم سروە بایە عەرشی خودا دێتە ئیهتیزاز**

ا ز ١٠ ل ١٣٦

هێندەی پەیوەندیی بە وەڵامدانەوەی ستەمەوە هەیە، بەشێكی دیكە. كە سەر بە جیهانی خراپە نەبێت، پێشتر بەیتی (٤ ب ٤ ل ٥٠) بە نموونە هێنراوەتەوە كە ناوەڕۆكی سەرەكیی لەم بەشەیدا چڕبۆتەوە: **"ئەگەر واعیظ دوصەد طە عنە بدا طە عنێكی لێ نادەم"**، بەڵام كاریگەریی "ئاه"، گەرمی و سووتێنەر بوونی، جگە لەو دوورایانەی خرانەڕوو، لە بناغەدا، دەرەنجامی عیشقە:

**بیبیـیٚ، یا نەیبیـیٚ، من داد و بیٚـــدادیٚ دەکـــەم**
**گەیٚ بداتـــیٚ، یا نەداتـــیٚ، ئاه و فەریادیٚ دەکـــەم**

١١ م ١ ل ٢٢٣

لێرەشـەوە باشـترین هەڵبـژاردنی عاشـق بـۆ ئـەوەی ببێتـە وەڵامـی راسـتەقینەی هـەموو چـرکەیەکی تایبـەت و هەسـتیار لـە ژیانیدا، و بیٚ ئەوەی لەگیانی عیشقەکەی دووربکەوێتەوە هەر ئـەو "ئاه"ەیە. کەواتە وەڵامنەدانەوەی ستەم بـە سـتەم لـە سروشـتی خـودی عیـشقەکەیە.. ئـەو عیـشقەی بـە هـۆی خۆشەویـستیی مەعشووقەوە هەموو "بەڵگە - آیة"کانی خۆشدەوێت، بۆیە ئەگەر هێزی سووتێنەری ئەو ئاهەش بەکاربهێنریٚ، ئـەوا بـۆ لەنێوبردنـی جەوهـەری خراپــە بــەکاردەهێنریٚ، ئەگەرچــی بــە رواڵــەت بــۆ سووتاندنی خراپەکار بەکارهێنراوە:

**بە ئاهــم گەر رەقیبانت بســوتێن، ئەی گوڵی رەعنـــا**
**مەرەنجــە، تو خودا شـــوعلە لە ئاقــاری چقڵ چبکا ؟**

٥ أ ٣ ل ١٤

لـەم خاڵـەوە وردیـی هەڵبـژاردنی چـەند خاڵێـك لـە لایـەن شاعیرەوە دەردەکەویٚ، بە تایبەتی هـەر چـوار وشـەی "سـەرد"، "گەرم"، "بەرد" و "بەرق". بە شـێوەیەکی گـشتی، و بـەدەر لـە سنووری ئەم دەقەش، وشەی "سەرد - سارد" هەمیشە ئامـاژەی "هەرەشەکردن لە ژیان" یان "کزیی ژیـان" بـەخۆوە دەگـریٚ. لـە

وەرزی ساردی ساڵدا "زستان" بەشێکی بەرچاوی گیانلەبەران جموجووڵی خۆیان بە تەواوی رادەگرن، و تەنانەت پەنا دەبەنەبەر کونی تایبەت بۆ ئەو ماوەیەی کە بە کردەوە هیچ رواڵەتێکی ژیانیان تێدا بەدی ناکرێ، بەشێکی دیکەش بەرەو ناوچە گەرمەکانی دیکە کۆچ دەکەن. نەخۆشییە تایبەتەکانی ئەو وەرزەش هەمیشە هەڕەشە لە بوونەوەرەکانی دیکە دەکات، کە هێندێکیان - ئەنفلەوەنزای باڵندە بۆ نموونە - کوشندەن. لە هەمان وەرزدا گەڵای بەشی هەرە زۆری دار و درەخت هەڵدەوەرێن، گیا دەبێتە پووشی تەواو یان سەرما دەیبات "دەسووتێ"، تەنانەت زوقم پتەویی زەویش دەخاتەبەر مەترسیی شیبوونەوەوە. جگە لەمەش، سەرمای لە رادەی ئاسایی بەدەر ئەندامەکانی جەستەی ئەو گیانلەبەرانەش سڕ دەکات کە توانای راهاتنی زیاتریان هەیە، و هێندێجاریش، کە کەرەستەی پێویستی خۆپاراستن لەبەر دەستدا نەبێت، رەقیان دەکاتەوە و کۆتایی بە ژیانیان دێنێ. لەوجۆرە ساردبوونەوەی کەشوهەوادا، تەنانەت رووکاری سەرەوەی هێندێ رووبار و چۆم دەیبەستێت و سیمای ژیانیان پێوە نابینرێ.

"مەحوی" لەو بەیتەدا ئەو وشەیە "سەرد"ی کردۆتە سیفەتی "قسە"، و لە بناغەشدا ئەو خەسڵەتەی زۆر زیرەکانە رەچاوکردووە، و ئەو "بێ گیانی"یەشی بۆ خوێنەر گواستۆتەوە

که له ناخی بەکارهێنەری ئەو "فسەی سەرد"ەدا، بە روونی، دەتوانرێ بەدی بکرێ. ئەمەشمان پتر پاش لێکدانەوەی دوا بەیتی ئەم غەزەلە بۆ روونده‌بێتەوە. لە کاتێکیشدا وشەی "سەرد" دەبێتە سیفەتی "هەناسە"، واتە بەم شێوەیە: "هەناسە سەرد"، دەبێتە تەعبیرێکی راستەوخۆ لە "بێوەری - نائومێدی"، کە مەعنای "مەرگی هیوا - چاوەڕوانی"، یان بەلای کەمەوە "لاواز بوونی هیوا - چاوەڕوانی"، بە شێوەیەکی بەرچاو، دەبەخشێ، ئەمەش، تەنانەت لە روانگەی ئەزموونی عیشقیشەوە، بەلای مەحوییەوە ترسناکە:

**له ناڵەی گەرمی دڵ باکت نەبوو تۆ**
**بە ئاهی سەردی " مەحوی " من دڵم سووت**

١٠ ت ٩ ل ٨٢

هەڵبەتە ئەو "سەرد"ەی لێرەدا مەبەستە لەو رووەوە ئاماژەی "هەڕشەکردن لە ژیان" بەخۆوە دەگرێت کە شادەماری زیندووی مرۆڤ بوون "بەهای مرۆڤ" دەکاتە نیشانەی تیری خۆی. وشەی "گەرم" بە پێچەوانەوە، ئاماژەی دەمارە هەرە زیندوو و بزێوەکانی ژیان بەخۆوە دەگرێ، نەك تەنها لەبەرئەوەی گیانلەبەران لە سایەی سەرمادا خۆسڕ دەکەن و بە گەرما دەبووژێنەوە، و درەختی بە سەرما گەڵا هەڵوەریو کە دنیا گەرم داهات سەرلەنوێ چەکەرە دەکاتەوە، و جیهانی بەستووش لەو

هەلومەرجەدا دەیکاتەوە، بەڵکو پتر لەبەرئەوەی لێواولێوبوونی هەر شتێك بە ژیان، هەمیشە بۆتە مایەی زیاد بوونی گەرمی، و لە هەموو ئەمانەش سەرنج راکێشتر و گرنگتر ئەوەیە کە گەرمی پێکهاتەیەکی گرنگ و بنەڕەتیی سروشتی عیشقە و پەیوەندیی عاشق و مەعشووق بە خۆی رنگرێژ دەکات:

**کە هەڵگیرسا لە نووری بادە شەمعی حوسنی جانانە**

**نەچێتە سەر طە ریقەی حەزرەتی پەروانە، دڵ، چبکا ؟**

٥ أ ٢ ل ١٤

**وەك بولبول، ئەو دلە، بە گوڵی روو، کە روو دەکا**

**پەروانەیە، زیارەتی شەمع ئارەزوو دەکا**

٩ أ ١ ل ٢٥

**نەبوە قەت " مەحوی "، وتی، بوونی من و تۆ پێکەوە**

**حوسنە ئاوی زیندەگی، عیشق ئاگرێکە دڵ بڕێژ**

٢ ژ ٧ ل ١٤٤

"بەرد" وشەیەکی زۆر گونجاوە بۆ دانانی، لە رووی بەرانبەرکێ پێکردندا، لەبری "قسەی سەرد"، ئەم جۆرە قسەیە "رەق"ە و "رەق بوون"یش خەسڵەتی هەرە دیاری بەردە، و بە هۆی ئەو خەسڵەتەشەوە ئازار بە ئەو کەسە دەگەیەنێت کە بە بەرد لێیدەدرێت، و شوێنی ئازار پێگەیەندراویش کاریگەریی بەسەرەوە دەردەکەوێت، و هەتا ماوەیەکی بەرچاو شوێنەواری

دەمێنێـــت، و ئـــامرازی دروســـتکردن و هێنانەکایـــەی ئـــەو کاریگەرییەش - واتـە بەردەکـە - هـەر دەمێنێتـەوە، و لـە رووی یاسـاییەوە دەبێتـە بەڵگـەی دەسـتدرێژیی بەکارهێنەرەکـەی. ئەمـەش کێـشەی تـاوانکردن، سـەلماندنی ئـەو تاوانـە بەسـەر خاوەنەکەیـدا، و لـە ئەنجامیـشدا یەکلاکردنـەوەی کێـشەکە بـە ئۆباڵهەڵگرتن، لە مەودای نزیك یان دووردا، دێنێتەئاراوە. مەحوی، لەم روانگەیەوە، دێتەوە سەر "واعیظ" و دەڵێ:

**زوبانی واعیظـی بێ دڵ درێـژە دەرحەق ئەهلـی دڵ**
**بەجێشـە، غەیـری ئەو مل پانە کێ بێ هەڵگرێ ئۆباڵ**

١ ل ٥ ل ٢٠٢

خەسـڵەتی دیکـەی بـەرد ئەوەیـە کـە پلـەی گەرمیـی چوارچێوەکە - ژینگە - وەردەگرێ، و "واعیظ"یش، لەو بەیتەدا بەشـێکی ئـەو ژینگەیەیـە کـە "شـێتانە بـەرد" ی تێدا لـە خەڵك دەگیرێ، بەڵکو پێکهێنەری سـەرەکییەتی. واتـە "سـەردی"، بـەو ئاماژەی "هەڕەشەکردن لە ژیان" و "کزیـی ژیـان"ەش کـە باسـی لێوە کـرا... لەمـەش بـەولاوە، بـەرد خـۆی بـێ گیانـە. بـەدەر لـە هەموو ئەمانەش، بەرد هەمیشە یەكێك بووە لەو دوو ئامرازەی بـۆ ئەشکەنجەدان و لەنێو بردنی عاشقان بەکارهێنراون:

**جونوونی نەو ظوهووره "مەحویا"دێوانەگیی مەنصوور**
**کە دێوانـەن هەموو مائیل بە بەرد، ئەو مەیلی داری کرد**

١ د ١١ ل ١١١

**خۆشـــی فەرمـــوو چ مەجنـــوون و چ مەنصـــــــوور**
**بەشـــی عاشـــق درا هـــەر دار و هـــەر بـــــەرد**

١ ر ٥ ل ١٢٠

وشەی "بەرق"، واتە بروسکە، تەنها ئاماژەی "گەرمبوون" بەخۆوە ناگرێ، بە هەموو ئەو دوورایيانەشـەوە کـە باسـيان لێـوە کرا، بەڵکو رووناکييشی هەیە:

**لە پڕ ئەو چاوە هەڵدەبڕێت و جەرگی عالەمێ دەبڕێ**
**نيـە، هەر بەرقـە غەمزەی دڵ شکافی، بێ بەريق ئەمما**

١١ أ ٢ ل ٣٠

**ئەو بەرقی جيلـوە شەوقی کە ئەمـڕۆ بڕی لە ماه**
**سينەی جيهانی بۆ بووە مەجمەر بە ناری شەوق**

٣ ق ل ١٨٣

ئــەو رووناکييــەش ئاســایی نييــە، بــەڵکو هێنــدە بــەهێز و کاريگەرە کە سەرچاوەی گەورە و بەهێزی رووناکيی وەکو خۆر، و سەرچاوەی تيـشکدەرەوەی ئاوێنەئاسـای ناسـراوی وەکـو مـانگ، شێوە و رواڵەتی ئاسـايی خۆيـان لـە دەسـتدەدەن و کـز و کـاڵ و دێنە پێشچاو:

**بریقەی بەرقی جیلـوەی کێ جەلا بەخشی بیناییمە**
**کە قورصی ئافتاب و مەھ وەکو تەم دێتە پێش چاوم**

٦ م ٣ ل ٢٢٣

**بریقـەی بـەرقی جیلـوەی تـۆ لـە چاوی.. نـەدا بـێ، بـۆ چییە ئاییـنە حەیران ؟**

٢ ن ٥ ل ٢٤١

ئا بەم کاریگەرییە گەورەیەشی کە هەمەلایەنەشە:

**ذەڕڕە تریـشقەییێکە کـە کێـوێ دەدا بـە بـا ئـەشـباھ ئەوەنـدە زۆرە بە کەس نایەتە شومار** (٧٤)

٢ ر ٤ ل ١٢٢

کە "بەرق" هەر ئەو "ئاھ و هەناسـەی گـەرم"ەیـە، کـە لـە جەوهەریدا ئـەو هەڵوێـستی بـێ دەنگییەیـە بەرانبـەر بـە "قـسەی سەرد" کە لە هەر شێوەیەکی دیکەی وەڵامدانەوە، بە دەست یـان بـە دەم، کاریگـەرتر و مانـادارترە. ئـەم بێدەنگییـە، جگـە لـە پەیڕەویکردن لەو هەموو ئایەت و فەرموودە پیرۆزانەی پێـشتر بـە نموونـە هێنرانـەوە، لـە لایەکـەوە رەنگدانـەوەی ئـەو پەنـدە عەرەبییەیـە کـە دەڵـێ "جـواب الاحمـق السـكوت"، لـە لایەکـی دیکەشـەوە شـێوازێکی دەروونـیی کاریگـەری ئەوتۆیـە کـە

"فەرامۆشـــی - ئیهمـــالکردن" دەکاتـــە چـــەکێکی کوشـــندە بـــۆ وەلآمدانـــەوەی ئـــەوجۆرە دەســـتدرێژییە بەســـەر "بـــەهای مرۆڤبـــوون"دا. لێرەشـــەوەیە کـــە مـــەحوی "ئـــاه و هەناســـەی گەرم"ەکەی بە "بەرق - بروسکە" داناوە، بـە رەچاوکردنی ئـەو کاریگەرییەش کە پێشتر روون کرایەوە.

" **کەسـێ شـێتانە بـەردم تـێ گـرێ** "، دوا وێـستگەی ئـەم بەیتەیە (٤ م ٨). ئەو خاڵەی کە لێرەدا روونـە دانـانی "بـەرد تـێ گـرتن"ە لـەبری "قـسەی سـەرد"، بـەلآم بـۆ وشـەی "شـێتانە" بەکارهێنراوە؟

دەکرێ لە سـەرەتای هـەوڵی وەلآمدانـەوەی ئـەم پرسـیارە بگەڕێینەوە بۆ ئـەوەی پێـشتر ئامـاژەی بـۆ کـرا کـە بەکارهێنانـی "قسەی سەرد" خیانەتە لە خود بەو پێیەی خیانەتـە لـە "بـەهای مرۆڤبوون". ئەمجۆرە خیانەتە ناکرێ لە "دامەزراوی و پایەداریـی مـرۆڤ لـە رووی بـیر و هۆشـەوە" هـەڵبقوڵێت... واتـە نـاکرێ مرۆڤێکی هۆشیار "عاقڵ" و ئاگادار لە بایـەخ و بـەهای مرۆڤانـەی خۆی - واتە مرۆڤێك بە راستی خـۆی بناسـێ -، نـاکرێ خیانـەت لەو بەهایە بکات. ئەم بەیتەی مەحوی شتێك دەدرکێنێ:

**لە بەنگ ئەم بەنگییانـە چی دەبینن؟: خۆ لە خۆ گۆڕین**
**لە دنیـــادا مـــەداری عەیش و خۆشی: خۆ نەناسینە**

١٠ هـ ٥ ل ٢٨٤

وشـــەی "بـــەنگ" واتـــە: "تلیـــاك"، کـــە ماددەیەکـــی بێهۆشکەرە، "بـەنگی"ش واتـە ئـەوەی تلیـاك دەکێـشێ - تلیـاك کێش -، کە بە کاریگـەریی ئـەو "بـەنگ"ە بێهـۆش دەبێـت. ئایـا "شـێت"یـش کەسـێك نییـە کـە "هـۆش - عـەقڵ"ی خـۆی لـە دەستداوە و لە ئەنجامی ئەوەشدا خۆی ناناسێتەوە؟

مەحوی لەو بەیتەدا گوتوویەتی: "**لە دنیادا مەداری عەیـش و خۆشی خۆ نەناسینە**"، لە بەیتێکی دیکەشدا دەڵێ:

**(رەحە) بەو شێتییە (الحق) قصـێکی عاقڵانەی وت**

**منـــم عاقڵ لە بەرگـــی عاریە خۆمم کە عاری کرد**

١ د ٩ ل ١١٠

لە بەیتی (١٠ هـ ٥) دا بە روونی شانۆی "خۆ نەناسین"ەکە، کە خولگەی خۆشی و رابواردنـی کاتییـە، ئـەم "دنیـا" یەیـە، کـە وشەی "عاریە"ش هەر مـەعنای دنیـا دەبەخـشێ. لـەم بەیتەشـدا "عاقڵبوون"، بە روونـی دیـارە کـە بەنـدە بـە خۆدامـاڵین "خۆمـم عاری کرد" لە خواستی دنیایی "بـەرگی عاریـە". ئـەم سـەرەتایە دەروازەی راســتەقینەی چــوونە نێــو جیهــانی غــەزەلی (٤ م)، و دەروازەی چوونە نێو جیهانی یەکێك لە چـەمکە هـەرە بناغـەیی و گرنگەکانی صۆفیگەرییە.

**شوکر هوشیارە "مەحوی"، تێ دەگا دنیا خەراباتە**

**کە بەدمەستی بکا ئەهلی، خراپەی بۆچی لێ دەگرم**

بـە سوپاسـگوزاری "شـوکرانەبژێری" دەسـت پێـدەکات، "الشکر - سوپاسکردن"یش یەکێکە لەو بنـەما گرنگانـەی کـە بـە نەبوونیان ناتوانرێ باس لە بوونی ئەزموونی صۆفیگەری بکرێت. ئەم چەمکە لە ئەدەبییاتی عیشقی حەقیقیدا سێ پلـەی هەیـە کـە نزمترینیان پلەی سوپاسـگوزاریی خـەڵکانی ئاسـایی "العـوام"ە و دووەمیان هی تایبەتان "الخواص"ە و سێیەمیشیان هی تایبەتانی تایبـەتان "خـواص الخـواص"[(٧٥)]ە. مـەعنای هـەرە ئاسـایی و بەرچاوی سوپاسگوزاری "خۆشیی دڵـە بـە وەدیهـاتنی نیعمـەت و ئاڕاستەکردنی ناخـە بـۆ ملکەچـی بـۆ نیعمـەترژێن و دانانـان بـەو نیعمەتەدا. یەکەمین پلەی سوپاسگوزاری بە زمـان "دانپێـدانان" و ملکەچـی دەکـرێ، دووەمیـان بـە جەسـتە "خزمـەتگوزاری" و سـێیەمیان بـە "دڵ" دیتـنی نیعمـەترژێن لـە کـاتی وەدیهاتنـی نیعمەتدا. زۆربەی جار وشەی "لوتف" بە هـەمان مـەعنای وشـەی نیعمـەت بـەکاردەهێنرێت، و "سوپاسـگوزاری"ش هەمیـشە بـە "منەتباربوون"ەوە گرێدراوە، بەمـەش لـە لایەکـەوە بزانـرێ کـێ شایانی بەرمنەت بوونە:

**موسـتەغنییە لە مەننـی سـەفینە و سـەفینەوان**

**هەر کەس کە ئیشـی هەر بـە خودا بێ، نە ناخودا**

٢ أ ٢ ل ٦

**بەخشـشـــی دنیـــا مەخـۆ، یەعنی بە نانێکـــی جۆ**
**خۆ مەکـەرە بـەر منــــەت پیــــــرەژنـــی نانـــــــەوا**

١٤ أ ٢ ل ٣٧

ئەمەش رێگە خۆشدەکات بۆ زانینی بەکارهێنانی شت، بە تایبەت لە رێبـازی عیـشقدا، بـەو ئاڕاسـتەیەی کـە پـڕ بـە پێـستی سوپاسگوزاری بێت:

**خوێنی جـەرگ و کونجـی عوزلـەت بەسمـە بـەش بـەر منـەت بوونی مەی و مەیخانە بۆچ ؟**

١ چ ٢ ل ٩٦

**بیٚ منەت رزقێکە غەم، بمرم لە برسان، ئەو دەخۆم**
**تەفرە ناخـۆم وطە لەب ناکەم لە دنیا قووتی رووح**

١ ح ٤ ل ١٠٢

لە لایەکی دیکەشەوە، لەم رێبازەدا نیعمەتی هـەرە بەرچـاو ئەوەیـە کـە رەنگدانـەوەی یـار و کردەوەکـانی بێـت، یـان ئـەو رواڵەتانـەی کـە رێوڕەسمـی خۆشەویـستیی بـیٚ کـەموکووڕی و راستەقینەی مەعشووقی تێدا بتوانریٚ بەدی بکرێت:

**دڵ بۆیە خۆشی دیٚ لە نەخۆشی بە پڕ بـــــە دڵ**
**بیمـــــــارە چاوی یار و خۆشی دیٚ لە دەرد و دا**

٢ أ ٣ ل ٦

**شوکر تۆ لە فکرم ناچی، ئەگەرچی من لە فکرت چووم**
**لە مـن غایب نەبی تۆ، بەسمە، با من بم لـــە تۆ غایب**

٥ ب ٤ ل ٥٢

**قــەبووڵم کــەی ئەگــەر، لــوطفێکــی زۆرە، بــە کەمـــــتر هیندووێکی خاڵی هیندووت**
**شـوکر هەر مامـــەوە بۆ یادگـــــاری بە کاری زەخمــەکەی شـمشـێری ئەبرووت**

١٠ ت ٣و ٤ ل ٨٠

لێرەشەوە چەمکەکان دەگۆڕێن و نیعمەت پەیوەندیی بە جیهانی فیزیکی "ماددی"یەوە نامێنێت، و بە تەواوی بـە چـەمك و بەهاکانی جیهانی صۆفیگەرییەوە پەیوەست دەبێت، کـە مـەحوی نـاوی "عالـەمی عیـشق و مەحەببــەت"ی لێنـاوە، یـان "دینــی عیشق":

**ئابــڕوو رێژە ویصالی یار و خـــــوێنڕێـژە فیراق**
**عالەمی عیشق و مەحەببەت هەر بڕێژە، هەر بڕێژ**

٢ ژ ٤ ل ١٤٣

ئەم جیهان "عالەم" و "دین"ە، هـەم رێوڕەسمـی تایبەتـی خۆیان هەیە، و هەم زاراوەی تایبەت:

**ئوصووڵی دینی عیشقە سووتن و بەس پەڕی پەروانەمە " جمع الجوامـع "**

**لوغاتی ئێمە ناڵە و ئاهــە (قطعـــــاً) لوغـەی وا ناگــرێ " بُرهان قاطع "**

٢ ع ٦ و ٧ ل ١٦٨

گۆڕانی چەمکەکان، لە بناغەدا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەم ڕێبازە کردەکی - عملی -یە لە بنەڕەتدا، وەکو ئەبو محەممەدی جەریری، لە وەڵامی پرسیارێکدا لە بارەی چییەتیی صۆفیگەرییەوە گوتوویەتی: "چوونە نێو هەموو ئاکار - ڕەفتار - ێکی باش و دەرچوون لە هەر ئاکارێکی خراپ"[٧٦] ڕەفتاریش، هەر لە سەرەتاوە، جیاوازە لەوەی لە جیهانی ئاساییدا، ڕۆژانە، بەدی دەکرێت:

**گلـەی " پێ " شم لەسەر " سەر " هەم بووە بار**
**کە دی من دولبەرم هات و بە " سەر " چووم**

**دەزانم بادیەی عیشقە خەطەرناک**
**کەچی هەر چووم، ئەگەر مام و ئەگەر چووم**

٧ م ٤ ل ٢٢٥

لە بواری سەرچاوەی بناغەیی ئایینیشدا، هێندە بەسە وەبیر بهێنرێتەوە کە یەکەمین وشەی قورئانی پیرۆز، پاش "بسم

الله الرحمن الرحيم"، کە هەموو سوورەتەکانی قورئـانی پێدەست پـێ دەکـات جگـە لــــە سـوورەتی "التوبـة"، وشـەی "الحمـد"ە: **الحمــد لِلّــهِ ربِّ العــالمِ / الفا ــة ٢ ،** کـە جەوهـەری سوپاسگوزاریی راستەقینەیە لە روانگەی باوەڕداران، بە گشتی، و صۆفییانەوە، بە تایبەتی.= ئەو سوپاسگوزارییەی بەیتی (٤ م ٩) ی پێدەست پێدەکات بۆ نیعمەتێکی تایبەتییە: "هوشیاری"، ئەم "هوشیاربوون"ەش لـە فەرهـەنگی صـۆفییاندا مـەعنای جیـاوازی هەیە، بەڵکو دوو مەعناشی هەیە:

١.مەعنا ئاساییەکەی هوشیاری، کە بەرانبەر بە "عاقڵی" و "دەرککردن بە شت" و زانینی هێنـدێ زانیـاریی ورد و نائاسـایی. ئـەم چـەمکە بـە چـەند چـەمکێکی دیکـەوە گـرێ دراوە، وەکـو "تێگەیشتن":

**بـێ کـەس منـم، کەسـێ لـە زوبـانم بگـا نیـە هەمـدەم خـودا نەناسن و دەم پڕ لە یاخودا**

١ أ ٢ ل ٣

**تێ گەیوو شیوەنیە ئەمــڕۆ، دا سبەی شـــایی بکا**

**پێ گەیوو دەروێشـــە دا سبحەی شــەهەنشـــایی بکا**

٦ أ ١ ل ١٦

هەروەها وشەی "دانا" هاومەعنایەکی دیکەی "هوشیار"ە:

**دەڵێ دانـــام و دڵ، خۆشی، دەخاتــە داوی زوڵف و خـــەط**
**ئەگەر عەقڵـــی هەیــە بۆچی حـەذەر ناکا لـــە مار و مـــوور**

٤ ر ٣ ل ١٢٨

وشەی " زانا " یان " دەزانی "ش هەروەها:

**دەزانـی جیفەیـە دنیـا، دە حەیفـە وەکـو سـەگ، ئـەم شـەڕ و شۆڕە لەسەر لاك**

١ ك ١٠ ل ١٨٧

دەشــکرێ ناڕاســتەوخۆ تــەعبیر لــە هوشــیاری بکــرێ، لــە ڕێگــەی ئــەو شـێوازانەوە کـە هوشـیاری دروسـت دەکـەن، وەکـو "دەرس - وانە" و "ئوستاد - مامۆستا":

**دەرسی عیشــقم هــەر لە کن پەروانــە یا بولبول بـــووە**
**بیگــەمێ، یا نەیگــەمێ، هەر مەشــقی ئوســتادێ دەکەم**

١١ م ٥ ل ٢٣٤

ئاساییبوونی ئەم مەعنایەی "هوشیاری" تەنها لـە شـێوەی بەکارهێنانەکەدایە، دەنا ئەگەر لە ڕوانگەی ئاسایی خەڵکـەوە، بـە کردەوە، ئەم بەیتەی مەحوی تـا چـەند لەگـەڵ ڕوانگـەی "ئەهلـی مەعریفەت"ی ئاسایی ئەمڕۆدا یەکدەگرێتەوە؟

**دەخاتـە فکری <u>ئەهلی مەعریفەت</u> شـــێوەی جەجاڵ (الحق)**
**دەبینـی بەعضە ئەشخاصێ بە دوویا خەرگەلەی مەخلووق**

٢ ق ٣ ل ١٨١

**بە ئاوی تێگەیشتنی ئێمە، دنیا، هەر سەرابێ بوو**
**هەموو دەشچن بە خنکان و لە وشکییشە مەلەی مەخلووق**

٢ ق ٦ ل ١٨٢

٢.بەرانبەر بە مەعنای "مەست"، واتە پێچەوانەی "مەست". ئەم "هوشیار"ە لەو هوشیارییەوەیە کە لە ئەدەبییاتی صۆفییانەدا وەرگێڕدراوی وشەی "صحو"ە، بەرانبەر بەو "مەستی"یەی کە وەرگێڕدراوی وشەی "سکر"ە. لە ژیانی ئاساییشدا هەر ئەمشێوە بەکارهێنانەی هەردوو وشەکە هەیە، بەلاّم لێرەدا چەندین شت دەبنە هۆکاری مەستی، لەوانە: دەرکەوتن – تەجەللی –، قسە – وشە –، رووناکی، یان هەر لوتفێکی دیکەی مەعشووق، و ئەم مەستییە پتر ساڵیك بەرەو قوولاّیی ئەزموونەکەی دەبات. کەچی لە "مەستی" ی جیهانی فیزیکیدا گەڕان بە دوای خۆشییەکانی ئەو جیهانە هۆکاری ئەو "مەستی"یەیە کە دابڕان لەو جیهانە یەکەمین دەرەنجامیەتی:

**بنازم بەو پیاڵەی چاوی مەستە بە یەك پرشنگی عالەم سەربەسەر مەست**
**لەبەر حوکمی نیگایا قاتە هوشیار هەتا چاوی بکا بڕ، مەستە هەر مەست**

٦ ت ٥ و ٦ ل ٧٣

بەلاّم ئەوەی لەم ئەزموونەدا، تەنانەت بەم شـێوەیەش، لـە روانگــەی خــەڵکانی ئاســاییەوە دوورە، ئەوەیــە کــە هــەموو بوونەوەرێك، نەك تەنها هـەموو گیانلەبـەران، هـەمان ئـەو حاڵەتـی هوشیاری و مەستییەی بەسەر مرۆڤدا دێت بەسەریاندا دێت. ئەمـە یان گشتاندنی "مەستی" و "هوشیاری"یە، یان مرۆڤاندنی هـەموو بوونەوەرێکە:

**شەو، دەبێ بادەی لە دەستی ساقییەك وەرگرتبـــــێ**
**ئەم سبەینێیە لە مەشریق دێتە دەر. مەســـتانە، رۆژ**

١ ژ ٦ ل ١٣٨

"هوشیاربوون"ی مەحوی، لە بەیتی (٤ م ٩) لەوەدایە کـە "تـــێ دەگـــا دنیـــا خەراباتـــە". هێنـــدەی پەیوەنـــدیی بـــە "تێگەیشتن"ەوە هەیە. ئەگەرچی ئەو ئاستەی لەم بەیتـەدا بـەدی دەکرێ ئاستی خەڵکە ئاساییەکە نییە، بـەلاّم ئـەو ئاسـتەش نییـە کـە لـە ئـەو هێمایانــە بگــات کــە "مــەحوی" نــاوی "رمــووزی مەعنەوی"ی لێناون:

**تێ دەگا هەر کەس بکا فەهمی رمــــووزی مەعنــــەوی**
**هیجر و وەصلـە نار و جەننــەی ئایەتی (لا یســــتوی)**

١٢ ی ١ ل ٣١٦

بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا سەرەتای یەکەمین هەنگاوی بەجێیە لە بواری دەستنیشانکردنی سەرچاوەی راستەقینەی خراپە، لە دەرەوەی سەرچاوەی ناوەوە "ناخی مرۆڤ – النفس". ئەم تێگەیشتنە، لە بواری بەرز و بەرێزڕاگرتنی بەهای مرۆڤدا، گەلێك لەم تێگەیشتنەی ئەم بەیتە بەرزترە:

**قەی کردنی سوراحی ئەگەر تێ بگەی، دەڵێ**
**دڵ تێکەڵ هاتنە لەگەڵ ئەم خەڵکە تێکەڵی**

٧ ی ٢ ل ٣٠٧

تێگەیشتنی بەیتی (٤ م ٩) دەرەنجامی **"لەت لەت کردنی سینەی رێش"ە بە "تێغی ناز" و "ئاو تێ گرتن"ی "لالەزاری پەژمووردە"**یە، واتە دەرەنجامی بووژاندنەوەی دەماری مردووە بە گیانی "جوانی" و "خۆشەویستی"، بەلاَم لە بەیتی (٧ ی ٢) دا دەمارگیری حوکم دەکات:

**وا دڵ بە داغم ئەز لە رەقیب، ئەر سەری بڕن**
**بۆ ئەکلی لەحمی ئەو سەگە من دەبمە حەنبەلی**

٧ ی ٣ ل ٣٠٧

بۆیە لە یەکەمین تێگەیشتندا خراپەیەکی گەورە لە ئارادایە بە چاکە وەلاَمدەدرێتەوە، بەلاَم لە دووەمیاندا خراپەیەکی ئاسایی لە ئارادایە بە خراپەیەکی گەورەتر وەلاَمدەدرێتەوە. لە یەکەمیاندا چاو لە خراپەکاریش دەپۆشرێ تەنها لەبەرئەوەی خاوەنەکەی

مرۆڤە، بەڵام لە دووەمیاندا خراپەیەك دەكرێتە بیانووی ئەوەی مرۆڤ لە بازنەی مرۆڤایەتی دەربكرێ، و نەك تەنها بكرێ بە ئاژەڵ، بەڵكو گۆشتەكەشی، بە پاساوێكی بێ بنەما بۆ خواردن حەڵاڵ بكرێ، و مەسەلەكەش لە چوارچێوەی شەریعەتدا بەو شێوەیە بخرێتەڕوو كە هیچ سەرچاوەیەكی یەكلاكەرەوەی نییە.

جەوهەری ئەم تێگەیشتنەی بەیتی (٤ م ٩) زۆر گرنگە: **"دنیا خەراباتە"**، واتە دنیا مەیخانەیە. لە نێو بەرهەمی صۆفییاندا وشەی "مەیخانە - مەیكەدە" و هاومەعناكانی زۆر بەكاردەهێنرێن، بەڵام لێرەدا بەو مەعنایە نییە، بەڵكو بەو مەعنایەی كە دنیاخوازی مرۆڤ هێندە بەرەو خۆی پەلكێش دەكات كە بە خۆی مەستی دەكات و لە پێناویدا ئامادەیە هەموو بەها و نەریتە جوانەكانی مرۆڤایەتی بەخت بكات. مەحوی هەر بۆ دنیا چەندین وشە و پێكهاتەی وەكو "بەحری فیتنە"، "شار"، "ئەرز"، "شەوی سەد شوو كەرە"، "فاحیشە"، "دەوران" و.. تاد، بەكارهێناوە:

**لەم بەحری فیتنە بەڵكی نەجاتت بدا خودا داوێنی باخودا بگــــرە، بەردە ناخودا**

١ أ ١ ل ٣

**بەجیٚ نایــیٚ، دەبیٚ رووکەینـــــە ســــــارا حەقــی ئادابــی مەجنوونی لە شــــــارا**

٣ أ ١ ل ٧

**کە شك بـەم "مـەحویا" هـەر شـەربەتی مـەرگ لەســـەر ئـەرزا نییــە ئاوی گـــــــەوارا**

٣ أ ١١ ل ١٠

**تا لە دنیأی دەر نەکردووی ئەم شەوی ســەد شوو کەرە "مەحوی" ئازانـە بدە تۆ ســیٚ بە ســـیٚ دنیــــا طـــەلاق**

١ ق ٧ ل ١٨٠

**ئاخــر ئەم دنیـایە ئەمری دیٚتە ســــەر: ئاخــر ببـــــــــە یەعنــی بەس ئەی فاحیشـە عالەم بە قڕ دە یەك بە یەك**

١ ك ٢ ل ١٩٤

**نە شەیتان و نە دەوران و نە خزمانم بە من ناکـــــــــــەن ئەوی نەفسـی خەسیسـم " مەحویا " کردوویە دەربــارەم**

٩ م ٧ ل ٢٣٠

لە هەموو ئەم بەڵگەیانەشدا کە بە نموونە هیٚنرانـەوە دنیـا، بەلای کەمەوە، سەرچـاوەیەکی گـەورەی خراپـەیـە، ئەگەرچـی لـە چەند بەیتیٚکیشدا بە "دایك - مادەر"ی ناودەبات، یان رواڵەتیٚکـی جوانی پیٚدەبەخشیٚ و دەخاتەڕوو، بەلاٌم وردبوونـەوە لـەو بەیتانـە ئەو راستییە رووندەکەنەوە کە ئەمەیان رووکارە نەك ناواخن:

**مـادەری گێـتی لـە شـیری بڕیـەوە دەبڕێتـەوە فائیـدەی چـی شەخصی لێ کەوتوو بەدادایی دەکا**

٦ أ ٦ ل ١٨

**بە زەرد و سوری دنیـــــــا زەردەواڵەت لێ نەگۆڕا بێ**

**بە هەنگی تێ بگەی، هەر نێشە، نۆشێکی نیە زەنبوور**

٤ ر ٨ ل ١٢٩

سەرچاوە بناغەییەکانی خراپە، لە روانگەی صۆفیگەرییەوە و لە روانگـەی خـودی ئایینیـشەوە بـە گـشتی، سێگۆشـەیەك بـەم شێوەیە پێکدەهێنن: شەیتان، ئـارەزووی دنیـایی، و نـاخی مـرۆڤـ خـۆی "النفـس". سـەبارەت بـە شـەیتان، کڕنـووش نـەبردنی بـۆ حەزرەتی ئادەم (ع) و دەرکردنی لە بەهەشت و ریزی فریـشتەکان بە هۆی ئەو کڕنووش نەبردنەوە ئاشکرایە. لە ئـەنجامی ئەمەشـدا، بــەپێی دەقــی قورئــانی پــیرۆز، رق و کینــەی بەرانبــەر بــە ئــەم بوونەوەرە بووە مایەی ئەوەی بەم شـێوەیە هەڕەشـەی لێ بکـات:

**لَعنه اللَّه وقَالَ لَأَتخِذَنَّ مِن عِبَـادِك نـصِيبا مفْروضـا(١١٨) ولَأُضِلَّنهم ولَأُمنِّينهم ولَآمرنَّهم فَلَيبتِّكُـنَّ آذَانَ الْأَنعـامِ ولَآمرنَّهـم فَلَيغيِّرنَّ خلْق اللَّهِ ومن يتخِذِ الشَّيطَانَ ولِيا مِن دون اللَّهِ فَقَد خـسِر خسرانا مبِينا / النسا ١١٨ و ١١٩** ، سەبارەت بـە " دنیـا " ش ئایـەت زۆرن، لەوانـە: **كُلُّ نفْسٍ ذَائِقَةُ الْمـوتِ وإِنمـا توفَّـونَ أُجوركُم يوم الْقِيامةِ فَمن زحزِح عن النارِ وأُدخِلَ الْجنةَ فَقَد فَاز وما**

**الْحياةُ الدّنيا إِلّا متاع الْغرورِ / آل عمران ١٨٥ ، وما الْحيـاةُ الدّنيا إِلّا لعِب ولهو ولَلدّار الْآخِرةُ خير لِلّذِين يتّقُون أَفَلا تعقِلُـون / الانعام ٣٢ و اعلموا أنّما الْحياةُ الدّنيا لعِب ولهو وزِينةٌ وتفَاخر بينكُم وتكَاثُر فِي الأموال والْأولَادِ كَمثَل غَيثٍ أعجب الْكُفّار نباتـه ثُمّ يهيج فَتراه مصفَرّا ثُمّ يكُونُ حطَاما وفِي الْآخِرةِ عذَاب شـدِيد ومغفِرةٌ مِن اللّهِ ورضوانٌ وما الْحياةُ الدّنيا إِلّا متاع الْغرورِ / ا ـديد ٢٠** ، لە درێژەی ئەم خوێندنەوەیەدا ئاوڕێکی دیکـە، بـە درپـژی لە "دنیا" دەدرێتەوە. سەبارەت بە ناخ "نفس"یش، ئایەت زۆرن، بەڵام صۆفییەکان پتر جەختیان لەسەر ئەم ئایەتە کـردووە: **وما أُبرّئ نفْسِي إِنّ النّفْس لأمّارةٌ بِالسّوءِ إِلّا ما رحِم ربّي إِنّ ربّي غَفُور رحِيم / یوسف ٥٣ .**

"مەحوی" لەم بەیتەدا، بە روونـی، ئامـاژە بـۆ ئـەم ئایەتـە دەکات:

**ئەسیر و صەیدی قەیدی کەید و شـەیدی نەفسی ئەممارەم**
**لە دەسـت ئەم مارە بەد چارە، چیـە چارم، خـــودا چـــارەم**

٩ م ١ ل ٢٢٨

دنیا و ئارەزووەکانی، کە لە قورئانی پیرۆزدا پتر بە "الحیاة الدنیا - ژیانی نزیك"[٧٧] تەعبـیری لێ دەکـــرێ،

**ئەگـەر ئـەم ئـەهلی دنیایـە، وەکـو هـەن، ڕێ خەنـە جەننـەت**
**دەنائەت زوو دەکا ئەو دوونییە لەم دنیایە دونیاتر**

٣ ر ٧ ل ١٢٦

مەبەسـتی بـەیتی (٤ م ٩) یـە. لـە ئـەزموونی صـۆفیگەریدا جڵەو شلکردنی مرۆڤ، لە ژێر کـارتێکردنی نەفـسدا، بـۆ ئـارەزووە دنیاییـەکان - بـە هـەموو لقەکانیـەوە - مایـەی هـەموو گوناهـە گەورەکانـە، و ئـەو گوناهانـە، وردە وردە لەکـە بەسـەر "ئاوێنـەی دڵ"[٧٨]ەوە بەجێدێڵن تا دەگاتـە ئـەوەی ژەنـگ بـە تـەواوی ئـەو ئاوێنەیە دەگرێتەوە و دایدەپۆشێ بە شێوەیەك کـە ڕووناکیی دڵ بە تەواوی دەشارێتەوە. لەم حاڵەتەدایە کە بە کردەوە دەتوانرێ بگوترێ جەستە بۆتە گۆڕستانی گیان. لێرەوە گەشتی ئەستوورتر بوونـی ئـەو لەکەیـە دەسـت پێـدەکات تـا ئـەو رادەیـەی هیـوا بـە رزگـاربوون بـە تـەواوی لاواز دەبێـت. ئەمـە لـە عورفـی عیـشقی حەقیقیدا ئەو ژەنگ گرتنەیە کە لەم ئایەتە پـیرۆزەدا باسـی لێـوە دەکرێـت: **كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ / المطففـ ١٤** ، و، ئەو ڕووناکییەش کە دەشاردرێتەوە، هەر لەو عورفـەدا، کۆکراوەی ئەو وینایانەیە کە لە ئایەتـەکانی: **فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ / الحجر ٢٩** و **فَـإِذَا سَـوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ / ص ٧٢** و **اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكَاةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ الْمِصْبَاحُ فِـي**

زجاجةٍ الزّجاجةُ كأنّها كوكب درّيّ يوقد مِن شجرةٍ مباركةٍ زيتونةٍ لا شرقّيةٍ ولا غَربّيةٍ يكاد زيتها يضِيءُ ولو لم تمسسه نار نور علـى نورٍ يهدِي اللّه لِنورِهِ من يشاءُ ويضرب اللّه الأمثَالَ لِلنّـاس واللّـه بِكُلّ شيءٍ علِيم / النور ٣٥ دا بـەدی دەكـرێ. لـە روانگـەی ئـەو ئەزموونـەوە، لـەم قۆناغـەدا مرۆڤـ بـە تـەواوی لـە عیـشق دوور دەكەوێتەوە، و تـا ئـەو چینانەی تـاریکی بەسـەر دڵـەوە زیـاتر و ئەسـتوورتر بـن، ئەگـەری خـۆ رزگـارکردن لاوازتـر دەبێـت. بـەڵام صۆفیگەری هەمیشه روو لـە لوتـف و رەحمـەتی خـودا دەكـات، و ئــەم ئایەتــە پیرۆزانــە بــە ئەگــەری بــەردەوامی گەڕانــەوە و لێخۆشبوون، لە قۆنـاغی یەکـەم، و وەرزشـی دەروونـی و لابردنـی چین بە چینی ئەو ژەنگانە، لە قۆناغی دووەمدا، دەزانێت: الّذِين يحمِلُونَ الْعرش ومن حولَه يسبّحونَ بِحمدِ ربّهـم ويؤمِنـونَ بِـهِ ويستغفِرونَ لِلّذِين آمنوا ربّنا وسِعت كُلّ شيءٍ رحمةً وعِلْما فَاغْفِر لِلّذِين تابوا واتّبعوا سبِيلَك وقِهم عذَاب الْجحِيمِ / غافر ٧ ، نبّئْ عِبادِي أَنّي أنا الْغفُور الرّحِيم / الحجر ٤٩ و قُلْ يا عِبادِي الّذِين أسرفُوا على أنفُسِهم لا تقْنطُوا مِن رحمةِ اللّهِ إِنّ اللّه يغفِر الـذّنوب جمِيعا إِنّه هو الْغفُور الرّحِيم / الزمر ٥٣ .

مـەحوی، بـە سـەرجەمی ئـەو زەمینەیـەی دەبێتـە مایـەی لەکـەداربوونی ئاوێنـەی دڵ بـەو شـێوەیەی کـە هـەموو رووناکیـی

بـشارێتەوە، دەڵـێ: "ظـوڵمـەتی وجـوود - تـاریکیی بـوون"، و ڕووناکیی بنەڕەتیی دڵ/یش بە "نووری عیشق" ناودەبات:

**تا ظوڵمەتی وجوودە تەریکی لە نـووری عیشـــق**
**سێبەر نەمــا هەتاوە، کە " مەحوی " نەما، خـودا**

١ أ ٧ ل ٥

شاعیر، نـەك هـەر ئـەو ناوانـە دادەنـێ، بـەڵکو ئاماژەیەکـی سەرەتایی، بەڵام ئێجگار بەهێزیش، بۆ میکانیزمی ڕزگـاربوون لـەو بارە تایبەتەش دەستنیشان دەکات. ئەو میکانیزمە لـە "**مـەحوی نەما**"دا چڕدەبێتەوە. ئەو "نـەمان"ە، هـەر لـە چوارچێوەی ئـەم خوێندنەوەیـەدا، لـە لێکدانـەوەی بـەیتی (٤م ٢) دا ئامـاژەم بـۆ کـردووە، کـە بەرانبـەر بـە وشـەی "فنـاء"ی عەرەبییـە، و مـن پێمباشترە وشەی "توانەوە"ی بۆ بـەکاربێنم. لـە چـەندین بەیتـی دیکەدا، هەر بەم مەعنایە، مەحوی ئەو وشەیەی بەکار هێناوە:

**بڕوانە سووتنم، وەرە بڕوا کە من نەمام.. پەروانەم ئیترم نیە پەروا کە من نەمام**

٢ م ١ ل ٢١٣

**سەر و ســامانمت پرسی، مەپرســـــە سەری تۆ خۆش، نـە سەر ماوە نە سامان**

٣ ن ٥ ل ٢٤٣

بەڵام شاعیر هەردوو وشـەی "فـەناء" و "عـەدەم"یـش، بـۆ هەمان مەبەست، بەکاردەهێنێ، لە پاڵ چەندین داڕشتنی دیکەدا:

**چ خەیاڵێکـە " بـەقا "[(٧٩)] بـێ بـە فـەنا چـوونی جەسـەد (تـا پریشان نشـود سر بسامان نرسد)**

٢ د ١ ل ١١١

**ئەگەر ئازادەگییەك بێ لە عەدەمدا بۆمـان چـی هەیـە غـەیری بە پێچی پەلەپەل داوی حەیات**

٣ ت ٤ ل ٦٤

یـەکێك لـەو نموونەیانـەی داڕشـتنەکانی مـەحوی بـۆ ئـەم مەبەستە "سەردانان"ە:

**تۆوی سەر خستووە بن خاکە، سەرئەفرازیـی بـەر**

**هــەر لە ڕێگەی گـەلەبا بوو سەری دانـا دانـــــا**

١٢ أ ٦ ل ٣٥

مــــەعنای ئاســـایی و ســـەرەتایی توانـــەوە "الفنـــاء"، لای صۆفییەکان، لەنێوچوونی خەسڵەتە خراپەکانە، و لە بەرانبەریشدا مانەوە "البقاء" دەرکەوتن و پایەدار بوونی خەسڵەتە چاکەکانە. لەم بوارەدا ئەوانەی بە تایبەتمەندییەکانی هـەر کەسـێك دادەنـرێ سـێ شــتن: کردەوەکــانی، ئاکــاری و حاڵــەکانی. کردەوەکانـــی هەڵبـژاردنی خۆیـەتی، ئاکاریـشی ئـەو سروشـتەیە کـە لـە سـەری

دروستکراوە، بەڵام دەتوانرێ بە راهاتنی بەردەوام چارەسەر بکرێ. حاڵیش لە سەرەتادا بەسەر مرۆڤدا دێت، بەڵام پاش خاوێنکردنەوەی کردەوەکانی، دەپاڵێورێ. هەریەك لەو تایبەتمەندییانە، کە دەگوترێ لە مرۆڤدا لەنێو دەچن، بەو مەعنایەیە کە چیدی هەست بە بوونیان ناکات، و بەو شێوەیە لە خودی خۆی و کردەوەکانی، و لە بینینی خەڵکیش - بەو مەعنایەی کە بەخۆیانەوە خەریکی بکەن - دادەبڕێت، و بە خەسڵەتەکانی مەعشووق دەمێنێتەوە [٨٠]. فەناش چەند پلەیەکی هەیە، لەوانەش فەنابوون لە خۆی و لە خەڵك. ئەم بەیتەی "مەحوی" دەکرێ لەو چوارچێوەیەدا جێی بکرێتەوە:

**کە تۆ غایب لەبەر چاوم دەبی، چم بێ لە تۆ غایب**
**قیامەت حاضری بەر چاومە، خۆمم لە خۆ غایب**

٥ ب ١ ل ٥١

"فەنا"، لەم بوارەدا دەرەنجامە نەك هۆکار. ئەو کۆشش و وەرزشە دەروونییە سەختەی پێوستە مرۆڤ لە بواری ئەزموونی صۆفیگەریدا بیگرێتە بەر، کە بە "المجاهدة" ناسراوە و بە ئایەتی پیرۆزی: **والذين جاهدوا فينا لنهدينهم سبلنا وإن الله لمع المحسنين / العنكبوت ٦٩** ی دەبەستنەوە، بریتییە لە "دابڕینی ناخ لەوەی لەسەری راهاتووە، و ناچارکردنی بەوەی هەموو کاتێك بە پێچەوانەی ئارەزووەکانی رەفتار بکرێ" - بە

پێی بۆچوونی قوشەیری. گەورە صۆفییەکی وەکو ئەبو عوسمانی مەغریبی لەبارەیەوە گوتوویەتی: ئەوەی پێیوابێ لەم ڕێبازەدا شتێکی بۆ دەکرێتەوە یان شتێکی بۆ ڕووندەبێتەوە، بە بێ پابەند بوونی بە (موجاهەدە) وە، ئەوا بە هەڵەدا چووە". ئەم وەرزشە، دەکرێ بە جەوهەری ئەزموونی صۆفیگەری لە قەڵەمبدرێت و هەمەلایەنەیە. لە لایەکەوە کێشەی گەورە لەوەدایە کە بە هۆکارەکانی خۆبەستنەوە بە دنیا و وارەزووەکانی زۆرن و بەهێزن، و تەنانەت گەورەیی تەمەنیش لەم بوارەدا ناتوانێ ببێتە مایەی شەرم لە خۆ کردن:

**لە پێ کەوتووم و نەفسم بۆ هەوا دەشنێ وەکو منداڵ**
**لەبەر پیری سەرم خۆی ناگرێت و تازە پێ دەگرم**

٥ م ٥ ل ٢٢١

**پیری نەمامی باغی جوانیمی کردە پووش**
**تازەم درەختی طوولی ئەمەل دەردەکا چرۆ**

١ و ٥ ل ٢٥٤

لە لایەکی دیکەشەوە، هەمیشە "من"ێکی خۆسەپێن مرۆڤ بەرەو پێشێلکردنی هەموو شتێکی ڕەوای، دەرەوەی خود، پێشێل دەکات:

**ببیە لە من، درەختی " منی " لەعنەتە بەری**
**یەعنی بکە لە کیبر و ئەنانییەت ئیحتیراز**

١ ز ٨ ل ١٣٥

بەلآم کێشەی گەورە لێرەدا ئەوەیە کە "ناخ - نەفس"، کە بە "خود" و "من" و ناوی دیکەش ناودەبرێ، هەموو هۆکارەکانی هێزی هەیە، و مرۆڤیش، بە تایبەت ئەگەر ئاوێنەی دڵی هێندە لەکەدار بوو بێ کە رووناکیی بە تەواوی داپۆشرا بێ، بەو بێ هێزی و تەنیاییە ناتوانێ رووبەڕووی ئەو ئەرکە گەورەیەی ئەزموونی ئەم عیشقە حەقیقییە ببێتەوە:

**قوڕێ بکەم بە سەرا، یا بە دادڕینی بەرۆك**
**حەقی مەحەببەت ئەدا بکەم، بدەی خودایا دەست**

٥ ت ٣ ل ٧٠

* *الرسلة القشیریة، ١٣٣ و ١٣٤.*

**لە پێ حەرامە زڕەی سیلسیلەی موقەددەسی عیشق**
**ببی بە شێر و مەگەر هەڵگری لە دنیا دەست**

٥ ت ٦ ل ٧٠

سەختیی ئەم "دەست لە دنیا هەڵگرتن"ە تەنها لەوەدا نییە کە لەلایەکەوە، بە رواڵەت، ناتوانرێ دەست لە خۆشییەکانی دنیا و ئارەزووەکانی هەڵبگیردرێت، و لە لایەکی دیکەشەوە هەردوو دوژمنی شەیتان و ناخ - نەفس - بەردەوامن لە جوانکردنی دنیا و ئارەزووەکانی، بەڵکو لەبەر ئەوەش کە جیهانی عیشق، پێش چوونە نێو ئەزموونەوە، ناتوانرێ بەو شێوەیەی لە جەوهەریەوە نزیکە وێنا بکرێت، و خودی مەعشووقیش، ئەگەرچی

ناوەڕۆکی راستەقینەی هەر میهر - خۆشەویستی - یە، بەلاَم لە ئەزموونەکەدا، بە رواڵەت " جەور - ستەم " یشی هەیە، کە لەوانەیە دەرەنجامی " تاقیکردنەوە - ابتلاء " بێت: **أم حسبتم أنْ تدخلُوا الْجنّةَ ولمّا يعلمِ اللّه الّذِين جاهدوا مِنكُم ويعلم الصّابِرين / آل عمران ١٤٢ ، ومكروا ومكر اللّه واللّه خير الْماكِرين / آل عمران ٥٤ و أم حسِبتم أنْ تتركُوا ولمّا يعلم اللّه الّذِين جاهدوا مِنكُم ولم يتّخِذُوا مِن دون اللّهِ ولا رسولِهِ ولا الْمؤمِنِين وليجةً واللّه خبِير بِما تعملُونَ / التوبة ١٦** . ئەگەرچی ئەوانەی بە راستی لە ئەزموونەکەدا رۆچوون لەو " جەور " ە دەگەن و پڕ بە دڵ بە دوویدا دەگەڕێن:

**بە نۆشی جانی وەردەگرم پیاڵەی زەهری هەر نێشێ**
**بە دەردی دڵ بچم گەر بێ لە جەوری تۆ دڵم بێشێ**

٥ ی ١ ل ٣٠٢

رێك بەرانبەر بەم مەنتیقە، کە جەوری خۆشەویست - مەعشووق - تێیدا خواستراو و ویستراوە و بە خەلاَتیش دەزانرێ، مەنتیقی تازەکار مامەڵە - بەخشین و وەرگرتن - و بێ ئارامییە:

**ئەو نەونەمامە کەی بەری میهر و وەفا دەدا**
**بۆ من، لە دەستی جەور و جەفادا، کە من نەمام**

٢ م ٢ ل ٢١٤

هوشـیاری و تێگەیـشتنی مـەحوی، لـە بـەیتی (٤ م ٩) دا لەوەدایـە دەرکـی بـەو راسـتییە کـردووە کـە **"دنیـا خەراباتـە"**، بەمەش لە راستیی ئەو خاڵە گەیشتووە کـە بنـەماکانی پەیوەسـت بوون بەو دنیایەوە پەیوەست بوونە بە شـتی کـاتی و فـەوتاوەوە، بـەڵکو لـە گەرمـە و خرۆشـی پابەندییەکەشـدا دەزانـرێ کـە ئـەو بنەمایانە هەر بێ بایەخن:

**دنیـــا کە هیچــە، جوملــە دەزانن، کەچـــی چ کـــەس**

**مەردانـــــە، بۆ خـــودا، نیــە دەس هەڵگـــرێ لە هیــچ**

٢ چ ٤ ل ٩٨

سەرچـاوەکانی شـانازی هــەر شــتێکی پەیوەســت بــەو دنیایەش، وەکو خۆ بە گەورە زانین و شانازی بـە بـاب و بـاپیران، هەمان ئەو بێ پایەییەی هەیە:

**بە چی، بۆچ ئـەم غورروور و کیبر و نازە، دەبیە تۆزێ خاك ؟**

**بە ئەصل و فەصل ئەنازی ؟ چۆڕە ئاوێك ئەصلتە و ئەووەل**

٤ ل ٥ ل ٢١٠

**فەضیلـەی ئەصل و فەصل ئینسانی پـێ نابێ بە صاحیب فەضل**

**کـە تـــۆ کۆســـەی، بـە تـۆ چـی مامــە ریشـــــی بـاب و باپیـــرت**

٤ ت ٦ ل ٦٧

لەمانەش بەولاوە، لەو خالآنەدا کە پەیوەندییان بە پێوەرە راستەقینەکانی بەهای مرۆڤەوە هەیە، هەمیشە دنیا بە کامی خەڵکانی نەزان بووە:

**لە رۆژێکی فەلەك ساقی بووە، تێفکــرە لەم بەزمــە**
**قەدەح ئاشامە هەر نادان، و هەر دانایە خوون ئاشام**

٣ م ٣ ل ٢١٦

وشەی "خەرابات"، وەکو لە دیوانیشدا مەعناکراوە، واتە "مەیخانە"، و پێشتریش باسی ئەوە کراوە کە هەم لە ئەدەبییاتی صۆفیگەریدا و هەم لای " مەحوی " ش، ئەوەی مەعنای "مەیخانە" ببەخشێ، بە هەردوو مەعنای رەچاوکراو لە ژیانی ئاسایی و مەعنای تایبەتی ئەزموونی عیشقدا، بەکارهێنراوە، نموونەی بەکارهێنان بە مەعنا ئاسایییەکە، لای مەحوی، زۆرە لەوانە:

**خوێنــی جەرگ و کونجــی عوزلەت بەســـمە بەش**
**بەر منــەت بوونــی مەی و مەیخانـــــە بــــۆچ ؟**

١ چ ٥ ل ٩٦

تایبەتمەندییەکی بەیتی (٤ م ٩) لەوەدایە کە تاقە بەیتی ئەم دیوانەی "مەحوی" یە کە وشەی "خەرابات"ی تێدا بەو مەعنایە بەکار هێنراوە.

دووەمین مەعنای ئەو وشەیە هەر لە چەمکی "سُکر - مەستی"ی صۆفییانەوە وەرگیراوە، کە پتر بە ئاماژە بۆ "تەجەللی - دەرکەوتن" ی مەعشووق بەکارهێنراوە. مەحوی بۆ ئەم مەبەستە چەندین وشەی وەکو "مەیکەدە" و "سەرچاوەی صەبوح"یشی لەگەڵ هەردوو وشەی "مەیخانە" و "خەرابات" بەکارهێناوە:

**چ یارایە بە بێ ئیمایی ئەبرۆ سەیری ئەو چاوە**
**حەرامە مەیکەشی لەم مەیکەدە بێ روخصەتی حاجیب**

٦ ب ٢ ل ٥٣

**ساقی، ئەی مایەی طەرەب لەب، پەرچەمت رەیحانی رووح**
**نیم خەندێ کە لە غونچە، دەرخە سەرچاوەی صەبووح**

١ ح ١ ل ١٠١

**لەبەر قاپیی خەراباتا، کە یا رەب دایمە ئاوا بێ**
**مەگەر خاکێ بەسەردا کەم، بکەم گاهێ دەماغێ چاخ**

١ خ ٤ ل ١٠٦

**لە مەیخانە، خودا، گەر ئێمە دەرچین بە کێ بەین ئیلتیجا، بۆ کێهە دەر چین ؟**

٦ ن ١ ل ٢٤٨

لە بەرانبەریشدا، بۆ ئەوجۆرە "مەی"ە چەندین وشەی دیکەی وەکو "بادە"، "شەراب"، "صەبووح"، "مەی" و... تاد، بەکاردەهێنێ، لەگەڵ چەندین وشەی تەواوکەری ئەم مەبەستە،

وەکو "مەیکەشی"، "ساقی"، "مەست"، "خەراب"، "حاجیب"، "پیاڵە"، "قەدەح" و... تاد زۆریی بەکارهێنانی ئەو وشە و دارشتنانە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە مەحوی شاعیرێکی صۆفییە، و لە روانگەی ئەو ئەزموونەوە، بە شێوەیەکی ورد بە وریایی، زاراوە کەرەستەی پێویستی خۆی هەڵدەبژێرێت و بەکاریاندەهێنێ. هەر ئەم هۆیەش بۆتە مایەی ئەوەی هەم تەنها هەردوو وشەی "مەیخانە" و "خەرابات"، و هەم هەر یەکەش تەنها یەك جار لە "دیوانی مەحوی"دا بۆ مەعنا ئاساییەکەی بەکاربهێنرێ. سەبارەت بە کاریگەریی هاتوچۆکردنی ئەو شوێنەش - هەر بە مەعنا ئاسایی و باوەکەی نێو خەڵك - شاعیر وشەی "بەدمەست" بەکاردەهێنێ، ئەویش هەر یەك جار، بۆ؟

به ئاسانی و بە خێرایی، لەبەرئەوەی لە "بەدمەستی"دا کەسی ژێر کاریگەریی "مەی"، بە مەعنا ئاسایی و باوەکەی، خۆیەتیی خۆی لەدەستدەدات، و پەنا دەباتەبەر جوێن و قسە و کردەوەی ناشیرین و نەشیاو بەرانبەر بە مرۆڤ، ئەمەش بە تەواوی هاوتای "قسەی سەرد"ە، کە لە بەیتی (٤ م ٨) دا بەکارهێنراوە. بەرانبەر بەم وشەی "بەدمەستی"یەی "مەیخانە"ی جیهانی فیزیکی، دەکرێ لە جیهانی عیشقی حەقیقی/دا، بە شێوەیەکی گشتی، وشەی "شطح" بەدی بکەین، هەڵبەت تەنها لەو رووەوە کە لەژێر کاریگەرییدا قسەی ئەوتۆ دەکرێ کە نابێ

بکرێت، چونکە بە پێی پێوەرەکانی ئەزموونی صۆفیگەری ئەو شتانەی لەوێدا دەدرکێندرێن بە "راز - نهێنی" لە قەڵەم دەدرێن و نابێ کەسانی دەرەوەی ئەزموون گوێیان لێی بێت، چونکە لێی ناگەن و بە شێوەی نابەجێ لێکیدەدەنەوە و دەرەنجامی خراپی لێ دەکەوێتەوە. مەولەویی ئێران "جەلالەددینی رۆمیی بەلخی" پێکهاتەیەکی بەو مەعنایە، بەڵام بۆ بڕست بڕین لە خودی عاشق، دروستکردووە: "مست مست":

**مســـتِ مســـتَم ساقیا دَســـتَم بگـیر تـا نأُفتـادم ز پـا دســـــتم بگــیر**[٨١]

بەلای مەحوی/شەوە بە رستەی "فڕی هەر عەقڵ و هۆشێ بوو" تەعبیر لەو ئاستەکراوە، بێ ئەوەی باس لە "مەی" و "مەیخانە" و "مەستی"ش بکرێت:

**بە جیاوەی ئەو، وەکو شەونم، فڕی هەر عەقڵ و هۆشێ بوو**
**کە سێبەر مەحوە لەو جێیـــە هەتاوی لەحظـــەیەك لێ کەوت**
١٢ ت ٧ ل ٨٦

هەر ناوێك بەکاربهێنرێ: "شەتەح"، "مەستی مەست"، یان "فڕینی هەر عەقڵ و هۆشێك". جەوهەری مەسەلەکە رۆچوونە لە ئەو رووناکییە لە وزە بەدەرەی "یار - مەعشووق" کە عاشق دەگەیەنێتە ئەو رادەیەی بە تەواوی هەیبەتی ئەو رووناکییە هەڵیبمژێت و لەو جیهانەدا بتوێتەوە، و دەرەنجامی ئەمەش

ڕێزگرتنە لە مرۆڤ، کە یەکێکە لە ئایەتە هەرە بەرجەستەکانی مەعشووق - وەکو پێشتر باسی لێوە کردووە - نەك جوێن پێدان و سووکایەتی پێکردن. لێرەشەوە وردەکارییەکانی شاعیر لە بەرانبەرکێ پێ کردنەکانی ئەم دوا دوو روون دەبنەوە.

شاعیر هوشیارە و دەزانێ دنیا خەرابات "مەیخانە"یە. لە دنیایەکدا کە دنیاخوازان هەرگیز لەو خواستەیاندا تێر ناخۆن:

**بە دەستی دوو دەکەون ئەهلی، ئەر لە پێ کەوتن**
**بەسم نەدیوە لە دنیا، هەتاکو بڕوا دەست**

٥ ت ل ٧١

هێندەش دنیاپەرست بن کە بە ئاسانی کەس نەتوانێ هێندە خواپەرست بێ:

**ئەوەندە ئەهلی دنیان، ئەهلی دنیا، تاقە رۆژێ، گەر**
**بە قەرنێ من ئەوەند ئەهلی خودا بم، دەبمە پێغەمبەر**

٥ ر ل ١٣٠

دەرەنجامی ئەم دنیا - خوازی و دنیا - پەرستی/یە، بێگومان، کەدنیا مەیخانە بێت، هەر ئەوەیە هێندەی لێ بخورێتەوە کە رەنگە "بەدمەستی"، لەو ئاستەی دەکرێ وێنا بکرێ، هێشتا کەم بێتە پێشچاو. وشەی "مەست" لە زمانی کوردیدا، بەدەر لە

پەیوەسـتەییەکان و خولگـە و کەرەسـتەی تایبـەتی خۆیـشی، کینایەیە لە زێدەڕۆیی لـە ویـستنی هـەر شـتێکدا. "مـەحوی" لـە بەیتێکدا ئەم مەعنایەی رەچاو کردووە:

**چیە خوسران ؟[٨٢]، ئەوەندە مەستی لەهو لەعبی دنیا بوون**
**برا، عومری گیرامی بەس لـە رێی ئەم بـادە بـــەر بـــا دە**

٣ هـ ٣ ل ٢٦٨

مەحوی لەو بەیتەدا یارییـەکی زیرەکانـە بکـات. جەوهـەری ئەو یارییە خراپە نەگرتنە لە مرۆڤ: "خراپەی بۆچی لێ دەگرم؟"، مـەنتیقی ئەمـەش "بـە خـەرابات بوونـی دنیایـە"، کـە دەرەنجـام ئەوەی "ئـەهلی" ئـەو "خـەرابات"ە بێـت، بێگومـان، هـەر دەبـێ هێندەی لێبخواتەوە کە "بەدمەست" ببێ. بەڵام ئایا ئەو مەنتیقـە پشت بە پاساوی عەقڵیی بەهێز دەبەستێ؟

با هەنگاو بە هەنگاو داوەرییەکانمان بەرەو پێشەوە بەرین. دنیا خەراباتە "مەیخانە"یە. لەو مەیخانەیەشدا بە چـەندین قۆنـاغ خراپەکارییـەکان دەخرێنەئەسـتۆی مرۆڤــەوە. سـەرەتا یەکەمـین قومی دەدرێتێ، چونکە خۆشییەکانی دنیای بەلاوە مەبەستە چـێژ لــەو قومــە وەردەگرێــت، و ئیـدی بـەرەو خواردنـەوەی زیـاتری پــەلکێش دەکـات تـا مەسـت دەبێـت. پاشـان سـنووری خـۆی دەبەزێنێ. سروشتی دنیاش ئەوەیە پیاڵـەی بـۆ پـڕ دەکاتـەوە تـا بەدمەستی دەکات، لە گەرمەی ئەو بەدمەستییەشـدا سـەرەتاکانی

دەســــتدرێژیکردنی لا دروســــت دەکـــات. لـــه ســـەرەتادا دەســتدرێژییەکان بــچووك و ســنوور بــۆ كێــشراون، و رەنگــه هاوشــێوەکانیش نەگرنــەوە. بــەلاّم سروشــتی "بەدمەســتی"ش هەمان سنووری زەلکاوە: هەمیشه مرۆڤ بەرەو خوارەوە – بـەرەو ئاسنه نزمەکان – رادەکێشیٚ، تا له زەلکاوی "خیانەت لـه بـەهای خود کرون"دا نوقمـی دەکات. دەسـتدرێژی، بـه گەشـەپێکردن و جۆراوجۆرکردنـی ئارەزووەکـان پەرەدەسـتێنیٚ تـا دەگاتــه ئـەو رادەیەی سنوورێك له بواری پێشێلکردنی مافی ئەوانی دیکەدا، لـه ئارادا نـامێنیٚ. دەرەنجـام، مـرۆڤ لـه چوارچـێوەی "مرۆڤبـوون"ی خۆی دەردەچیٚ و دەبێته نیمچه درِندەیەك:

**چاویان ئــەم ئەهلــی دنیایـــه ئەوەنـــدە برســـییه**
**پادشــاکانی بــه دەمــدا، یەك ســەری یەکتـــر دەبات**

١ ت ١٣ ل ٦٠

ئەمــەش نــەك تــەنها دەبێتــه رەوشــتی "پادشــاکان"، کــه هــەموو دەســەلاّت و ســامانێکیان لەبــەر دەســتدایه، بــەڵکو ئــەو شوێنانەش دەتــەنیٚ، کـه بـه رواڵـەت، دەبـیٚ ئاسـتێکی گونجـاوی بەخۆداچوونەوە و له خودا ترسانیان تێدا بەدی بکریٚ:

**ئەغڵەبەی تەکیــــه و و دەرگاهـــی بیـــلادی رۆمـــم**
**پشـــکنی، دی: چەلـــەبی هــەر جەڵەبی بوو، دەدە دەد**

٢ د ٣ ل ١١٢

دەرەنجـامیش.. ئەگەرچـی بـە رواڵـەت ژیـان بـە هـەموو بگرەوبـەردەکانی لـە شـەپۆلانی بەردەوامدایـە، و دوور لـە بیرکردنەوە لە مەرگ، مرۆڤـ لە هەوڵی گەیشتن بەو ترۆپکانەدایە کە رەنگە پێشتر خەونی پێیانەوە نەدیبێ... ئا لەمکاتانـەدا، لـە روانگەی ئەم ئەزموونەوە، ژیانی راستەقینە ونە:

**لە بۆ ئەربابی دنیا قەت مەدە بەسـط و بەیانـی عیشـق**
**کە " مەحوی " شەرحی نوکتەی جانفزا بۆ مردووە ضایع**

ا ع ٧ ل ١٦٦

ئـەم هەلومەرجـە، بـە هـەموو وردەکارییەکانییـەوە، ئایـا دەرەنجامی ئەوە نییە کە ئەو مرۆڤە لـە ریـزی ئەوانەدایـە کـە بـە "ئەهلی دنیا" ناوبراون؟ ئایا "ئەهلی دنیا"بـوون، بـە شـێوەیەکی روون و راستەوخۆ دەرەنجامی هەڵبژاردنی ئازادانەی مـرۆڤ نییـە؟، واتـە: ئایـا مـرۆڤ بەرپرسـی تـەواو نییـە لـە هەڵبـژاردنی ئـەو هەلومەرجەی کە شاعیر بە "خەرابات - مەیخانە" نـاوی بـردووە؟ و ئایا بەوەش نابێتە لێپرسراوی راستەوخۆ و تەواوی "بەدمەست" بوونـی؟ کەواتـە بۆچـی "مـەحوی" خراپـەی لێنـاگرێ؟ پێموایـە ئەمەش دووبارەکردنەوەی بەیتێکی دیکەی خۆیەتی:

**نەقشـی خودا ببینـە، لە خەڵقـی خودا گـەڕێ**
**گـەر ئەهلـی ئیحتیـرازی لە کەس مەگرە ئیعتیـراض**

١ ض ٦ ل ١٥٧

ئـەو بەیتــەش زایەڵـەی قـسەیەکی ئێجگـار گـەورە و وردی صۆفییەکی ناسراوە.. قسەی ئەبو سەهلی صەعلووکی کە دەڵـێ: " صۆفیگەری خۆ گرتنە لە رەخنە و تـوانج گـرتن "[٨٣]. ئەمـەش گۆشەیەکی دەگمەنی ئەم بوارەیە.



## پەراوێزەکان

١. اديان و مكيبهاى فلسفى هند، ج ١، صفحه ٢١٥ تا ٢٢١ .

٢. لەوانە، د. عبدالرحمن بدوى لە كتێبى : رابعه العدويه ..... .

٣. شرح المعلقات العشر المذهبات، ص ص ٣٢٥-٣٢٦ و، موسوعه الشعر العربى ( الشعر الجاهلى ) ص ص ٢٤٧-٢٤٨ .

٤. ديوانى مەحوى، پەراوێزى ئەو بەيتە، ل ٢١٧

٥. اللمع في التصوف، ٢٤ .

٦. قوت القلوب، ١٤٦ .

٧. التعرف لمذهب اهل التصوف، ١٣ .

٨. الترمذي، ١١/١٦٢، ح ٣٢٥٧، بصيغة – اذا اخطأ خطيئة – : سنن ابن ماجة ١٢/٢٩٤، ح ٤٢٣٤ و مسند احمد ١٦/١٥٣، ح ٧٦١١ و سنن البيهقي الكبرى ١٠/٢٨٨، بصيغة - اذا اذنب –، مصنف ابن ابي شيبة ٧/١١٢، بصيغة - ان الرجل ليذنب – .لە شوێنى دیکەدا بە جۆرى دیکە هاتووە، بۆ نموونە : موطأ مالك ٦/١٣٠ و مسند احمد ٤٧/٢٦٢، ح ٢٢١٩٣ : " لا يزال العبد يكذب و تنكت في قلبه نكتة سوداء حتى يسود قلبه كله "، صحيح مسلم ١/٣٤٩، ح ٢٠٧ : بصيغة " تعرض الفتن على القلوب كالحصير.

٩. بڕوانە : البيضاوى ٣/١٧٨، الدر المنثور ٤/٣٠٩، تفسير ابي السعود ٤/ ١٠٩، فتح القدير ٢/ ٤١٣ و تاد...

١٠. بڕوانە : المائدة ٧١، الانفال ٢٥ و ٢٨، يونس ٨٥، الاسراء ٦٠، الانبياء ٣٥ و ١١١ و تاد ...

١١. صحيح البخاري، بدء الوحي، ١/٣ ح ١، سنن ابي داود ٦/١١٨، ح

١٨٨٢، سنن ابن ماجة ١٢/ ٢٧٤ ح ٤٢١٧، سنن البيهقي الكبرى ١ / ٤١ و ٢١٥، المعجم الاوسط ١/٤٣ ح ٤٠ و ١٥/٣٢٥ ح ٢٤٩ و تاد...

١٢. له دروست كردنی خانوو له كوردەواریدا، بە تایبەت ئەو شێوازەی " سەنگچن – وشكە كەڵەك " ی پێ دەگوترێ و، پشت بە شێوەی دانانی بەردەكە دەبەستێ، نەك بەو شتانەی دیكە كە بەردەكان پێكەوە دەبەستنەوە ( قسڵ، گەچ، قوڕ )، هەڵبژاردن و دانانی " بەردی گۆشە "، واتە ئەو بەردەی لە هەر چینێكی هەر گۆشەیەكی دیوارەكەدا دادەنرێ، گەلێك گرنگە و پێویستی بە وردەكاریی زۆر هەیە، چونكە لە راگرتنی دیوار و بیناكەدا رۆڵی بناغەیی هەیە .

١٣. سەرجەمی بەرهەمی گۆران، بەرگی یەكەم، دیوان، ل ٢٦٧ .

١٤. نەك تەنها لەڕووی ئەكادیمییەوە، بەڵكو لە ئەزموونی وەرزشی رەوانی – الرياضة الروحية – شدا بە گشتی، لە ئایینی هیندۆسییەوە تا ئیسلام، عیشق هەر بە رێباز ( منهج – طريقة ) دانراوە، " مەحوی " ش وای ناو دەبات :

١٥. لە سەرچاوە بناغەییەكانی فەرموودەكان – متون الحديث – تەنها " سنن الترمذي، ٥ / ٤٥٦، ح ٣٣٧١ " دەیگێڕێتەوە و دەڵێ : " ئەمە لەم رووەوە فەرموودەیەكی غەریبە و، تەنها لە گێڕانەوەی " ئەبو لوهەیعە" وە دەیزانین . بەڵام چەند فەرموودەیەكی دیكە لەبارەی هەمان بابەتەوە دەگێڕێتەوە، لەوانە : " پاڕانەوە خۆی خواپەرستییە – الدعاء هو العبادة، ح ٣٣٧٢ – لە نوعمانی كوڕی بەشیر/ ەوە و، "ئەوەی لەخوا داوا نەكات لێی تووڕە دەبێ – من لم يسأل الله يغضب عليه، ح ٣٣٧٣ – " و " هیچ شتێك لای خوا لە پاڕانەوە بەڕێزتر نییە – ليس شئ اكرم على الله من الدعاء "، ٥/٤٥٥، ح ٣٣٧٠ .

[16]. لـە " الرسـالة القـشيرية، ٢٩٦ " دا ئـەوە دووپـات دەكاتـەوە . لـە ڕێوڕەسمـی ڕێبـازی عیـشقی حەقیقیـدا هـەر خـودی پابەنـد بـوون بـە خۆشەویستی ئەوە بەسەر عاشقدا دەكاتە ئەرك كە بە تەواوی پابەندی ویست و خواستی مەعشووقەكەی بێت و لە فەرمانی دەر نەچێت، خودی قوشەیری لە هەمان كتێبدا ئەوە دەگێڕێتەوە كە ئەو كاتەی شیبلی لە نەخۆشخانەدا.

[17]. بڕوانە : " نتائج الافكار القدسية ... ٣ / ٣٨٩ و ٣٩٠ " روونە كە بەلای عەرووسییەوە تەنها لە سەرەتای ئەزموونی صۆفیگەریدا مورید پاڕانەوە بەكار دەهێنێ ، كە گەیشتە ئەو قۆناغەی ویستی خۆی بە تەواوی لەدەست دا و خۆی و كارەكانی بە تەواوی بە خوا سپارد ئیدی لەو بازنەیە دەردەچێ و خوا خۆی هەموو كارێكی بۆ هەڵدەسووڕێنێ . واتە كە گەیشتە قۆناغی توانەوە - فەنا - ی كردەوەكانی .

[18]. صحیح البخاري، ٥ / ٢٣٤٥، ح ٦١٣٧، الاتحافات السنية، ١ / ٦٣ و ٦٥، ح ١٤٠ و ١٤٢، مجموعة الحديث ٤ / ٣٣١، ح ١٩٦٧، و سەرچاوەی زۆری دیكەش .

[19]. وشەی ( ذكر ) ی عەرەبی، لە رووی زمانەوانییەوە، مەعنای " باس كردن - ناو هێنان " دەبەخشێ، هێندەی پەیوەندیی بە زیكری خواوە هەیە، كە وشەكە بۆتە زاراوەیەكی تایبەت، ئەو وەرگێڕانەم بە گونجاو نەزانی، بۆیە هەمان وشەی " زیكر " م بەكار هێنا كە كورد بەكاری دەهێنێ .

[20]. باع: هێندەی درێژ كردنی هەردوو دەست - القاموس المحيط، ٢ / ٢٥٦ و كتاب العين ٢ / ٢٦٤ -، یەك میلی شەرعیی هاشمی هەزار باعە، واتە ١٨٤٨ مەتر - معجم لغة الفقهاء ١ / ٤٧٠ -، واتە هەر باعێك نزیكەی ١٨٥

سەنتیمەترە .

[٢١]. صحيح ابن حيـان، ٣ / ٣٩٣، ح ٨١١ . الجـامع ١١ / ٢٩٢، ح ٢٠٥٧٥ . مـشكاة المـصابيح ٢ / ٦٩٨، ح ٢٢٦٤ . مجمـع الزوائـد ١٠ / ٨٧ . الاربعـون الصغرى، ١ / ٨٧، ح ٤٣ .

٢٢. ابن حيان ٣ / ٩٧، ح ٨١٥ . الزهد لابن مبارك، ١ / ٣٨٨، ح ٩٥٦

[٢٣]. الرعاية لحقوق الله، ٥٤ و ٧٠ .

٢٣ .أ. الرعاية لحقوق الله، ٥٤ و ٧٠ .

[٢٤]. الورَع ( ئەلوەرەع ) : لەرووی زمانەوانییەوە مەعنای زۆریی رووگـیر – احـراج – بـوون، العـين ١٣٧، ترسـنۆكی لاواز ، المحيـط في اللغـة ١ / ١٩١، ئەو بچووكە لاوازەی دەوڵمەنـدیی لێ نایـەت، الـصحاح ٢ / ٢٧٥ و، دەست هەڵگرتن و وازهێنان، المحكم و المحيط الاعظم ١ / ٣٢٧ دەبەخشێت و، رووی زاراوەشــەوە : دووری لــە گومانزاكــان – الـشبهات – لــە ترسـی كەوتنە نێو شتی حەرام، التعريفات ٨٩، دەست هەڵگرتن لە خراپە، جمهـرة اللغة ١ / ٤٢٨، بزوێنەری خۆڕاپارێزی، القاموس المحيط ٢ / ٣٢٥ و، زانين – زانست – قووڵبوونەوە تێیدا، القاموس الفقهي ٩٧ .

٢٥. رسالة المسترشدين، ١٦٤و ١٦٥ .

[٢٦]. المسائل في اعمال...، ٧٥ .

[٢٧]. التعرف لمذهب اهل التصوف، ٧٣ .

[٢٨]. الرسالة القشيرية، ٢٥٦ .

٢٩. نتائج الافكار القدسية، ٢ / ١١٧ .

٣٠. الفتح الرباني و الفيض الرحماني، ١٠٦ .

[٣١]. لــە ئایــەتی ( الحجـر ٥٦ ) دا وشــەی " يقنــط " بــەكار هێـنراوە، كـە

مەعنای "نائومێد دەبێ "، "بێوەر دەبێ" دەبەخشێ و، لە وشەی "قنوط" ەوە، واتە "بێوەری" وەرگیراوە . وشەی "روح، رەوح" ی ئایەتی (یوسف ٨٧) یش مەعنای "رەحمەت" دەبەخشێ.

٣٢. بۆ زیاتر تێگەیشتن لەم مەسەلەیە، خوێنەری بەڕێز دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ لێکدانەوەی ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە لە هەر یەکێك لە تەفسیرە کۆنەکانی : (الطبري )، ( ابن كثير )، ( القرطبي )، ( الرازى )، ( البيضاوى )، ( البغوي ) و .... تاد .

٣٣. الرسالة القشيرية، ٣٤٢ .

٣٤. بەشێکی بەرچاوی تەفسیرەکان ئەو بۆچوونەی قوشەیری پشتڕاست دەکەنەوە، لەوانە : البيضاوي ٢ / ٤٩٢، القرطبي ٧ / ٣٧، الدر المنثور ٣ / ٣١٤، المحرر الوجيز ٢ / ٣٢٠، فتح القدير ٢ / ١٣٨، الجلالين ١ / ١٧٧، النسفي ١ / ٣٣٤، روح المعاني ٧ / ٢١٨، السمرقندي ١ / ٤٥٨، التسهيل لعلوم التنزيل ٢ / ١٥ ...و تا.د .

٣٥. ئەوە قسەی " ابن عباس " نییە، چونکە لە تەفسیرەکەیدا لەبارەی ئەو ئایەتە پیرۆزەوە دەڵێ : " بۆ ئەوەی ملکەچم بن، ئەمەش فەرمانێکی تایبەتە بۆ ئەوانەی ئەهلی ملکەچین بۆ خوا و، دەگوترێ ئەگەر خوا بۆ پەرستن دروستی کردبان بۆ یەك چاو تروکاندنیش سەرپێچییان نەدەکرد " تنوير المقباس .. ١ / ٤٤٣ . بەڵام چەندین کتێبی تەفسیر دەیداتە پاڵ " مجاهد "، لەوانەش : القرطبي ١٧ / ٥٥، البغوي ٤ / ٢٣٥، فتح القدير ٥ / ٩٢ و ابو السعود ٨ / ١٤٥ .

٣٦. اللمع فى التصوف، ٤٠ .

٣٧. بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی رەنگدانەوەی ئەو چەمکە لای هێندێك شاعیری کورد، بڕوانە : عەبدوڵڵا قەرەداغی، پاشەڕۆژبینی لە روانگەی دوو

شاعیری صۆفیی کوردەوە، گۆڤاری گەلاوێژی نوێ، ژ ٢، تەمووزی ١٩٩٧، ل ٧١ تا ٨١ .

٣٨. ابو نصر السراج الطوسي " ئەم چەمکەی بەکار هێناوە و لەبارەی ئایەتی پیرۆزی : فَاتَّقُوا اللَّه ما استطَعتم واسمعوا وأطِيعوا وأنفِقُوا خيرا لِأنفُسِكُم ومن يوق شحّ نفْسِهِ فَأُولَئِك هم الْمفْلِحونَ التغـابن ١٦ ) ەوە دەڵێ : "پێ داگرتن لێرەدا لەوەوەیە کە ئەگەر هەزار رکات نوێژت کرد و دەتتوانی رکاتێکی دیکە بکەیت و بۆ کاتێکی دیکە دوات خست، ئەوا دەستت لە توانات هەڵگرتووە و، ئەگەر هەزار جار زیکری خوای گەورەت کردبێ و بتوانی جارێکی دیکەش زیکری بکەیت و بۆ کاتێکی دیکە هەڵیبگریت، ئەوا دەستت لە توانات هەڵگرتووە و .. تاد، " اللمع في التصوف، ٨٧ ".

٣٩. قوشەیری لەسەر زمانی ( ابو سليمان الداراني ) یەوە دەڵێ : " لە بەهەشتدا دەشتی بە پیت هەیە، ئەگەر کەسێك زیکری خوا بکات فریشتەکان دەست دەکەنە درەخت چاندن تێیدا، ئەگەر بوەستێ لەوانەیە یەکێك لە فریشتەکان بوەستێ، پێی دەگوترێ بۆ وەستایت ؟، دەڵێ برادەرەکەم سارد بووەوە، " الرسالة القشيرية، ٢٥٩ ".

٤٠. لە ژێر تێبینیی ژمارە - ١٢ - دا ئاماژە بۆ هێندێك لەو کتێبانەی فەرموودە کراوە کە ئەو فەرموودە قودسییەیان هێناوەتەوە ، هەروەها ئەم کتێبانەش هێناویانەتەوە : صحيح ابن حيان، ٢ / ٥٨، ح ٣٤٧، الجمع بين الصحيحين، ٣ / ٢٤٠، ح ٢٥٠٨، سنن البيهقي الكبرى ٣ / ٣٤٦ و ١٠ / ٢١٩، ح ٦١٨٨ و ٢٠٧٦٩، مجمع الزوائد ١٠ / ٢٦٩ و كنز العمال ١ / ١٢٨، ح ١١٦١ و ٧ / ٣١٧، ح ٢١٣٢٧ . لەوێ وەرگێڕدراوی ئەم فەرموودەیە بە کوردی دەبینرێ و لێرەدا بۆ بەڵگەدار کردنی زیاتر دەقی فەرموودەکەم، وەکو خۆی، بە عەرەبی بڵاو کردۆتەوە . ئەو فەرموودە قودسییە بەو شێوەیەی

لێرەدا تۆمار کراوە و بە شێوەی دیکەش لەو کتێبانەدا بڵاو کراونەتەوە و ریوایەتیان دراوەتە پاڵ کەسانی زۆر نزیك لە پێغەمبەرەوە (ص)، وەکو " عەبدوڵڵای کوڕی عەباس، کە ئامۆزایەتی و، هەردوو هاوسەری پێغەمبەر " عائیشە " و " مەیموونە " و " ئەبو هورەیرە " .

٤١. لە پەراوێزی ژمارە (٢٣) و روونکردنەوەکەی پاشیدا پشت بە چەند کتێبێکی فەرموودە بەستراوە کە مەبەستێکی تایبەت لەم ئایەتە پیرۆزە هەیە .

٤٢. هەموو ئەم بەیتانەی " مەولەوی " وەرگیراون لە : دیوانی مەولەوی / یەکەی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس .

٤٣. هەردوو بەیتەکە لە : ( دیوان حافظ ) ەکەی محمد قەزوینی و د . قاسم غەنی / یەوە وەرگیراوە، یەکەمیان لە غەزەلی ١٥٢ ل ١٧٦ و دووەمیان لە غەزەلی ٣ ل ٩٨، ئەمەش وەرگێڕانی هەردوو بەیتەکەیە : ١ . لە ئەزەلەوە، واتە لە خاڵی بێ سەرەتاییەوە، پرشنگی جوانیت دەمی لە تەجەللی دا - باسی تەجەللیی کرد -، " بەوەش " عیشق پەیدا بوو  هاتە ئاراوە، دەرکەوت - و ئاگری لە هەموو جیهان بەردا. ٢. من لە جوانیی هەموو رۆژێك روو لە زیاتر بووی یووسف / ەوە - لەو جوانییەی یووسف / ەوە کە رۆژ بە رۆژ هەر زیاتر دەبوو - زانیم، کە عیشق - تینی خۆشەویستی - هەر دەبێ زولەیخا لە پەردەسەرا - حەرەم - پاکی - داوێن پاکی - دەربێنێت .

٤٤) بوستان شیخ شیراز، ١٦، ئەمەش وەرگێڕانەکەیەتی : " ئەگەر دەتەوێ ئەو سەرزەمینە تەی یکەی - ببڕیت -، دەبێ پێشتر سۆراخی گەڕانەوەی ئەسپەکەت بکەیت . لە ئاوێنەی دڵ ورد ببیتەوە و رابمێنی و، وردە وردە ئاسوودەیی وەدەست بهێنی . مەگەر بۆنێکی عیشق - بۆنێك لە

عیشقەوە - مەستت بکات و، بتکاتە داخوازیکاری پەیمانی " ئەلەست "
٤٥. غزلیات شیخ شیراز، ٦١٠، ئەمەش وەرگێڕانەکەیەتی : هەموو تەمەنم سەر دەرناهێنم لەم خوماری سەرخۆشییە - مانەوەی سەرخۆشی سەرئێشەی بۆ رۆژی دواتر - " کە من هێشتا دروست نەکرابووم - هێشتا نەبووم - تۆ لە دڵمدا دانیشتی - جێگیر بوویت – . (٢٧) کشف الاسرار، ٨ / ٢٥١ .
٤٦. جیاوازی لە نێوان فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا هەیە لە لێکدانەوەی ئەو وشەیە، لە لایەکەوە وا لێك دەدرێتەوە کە " ددان نانە بە خودا و ئەو پەیمانەیە کە خوا لەو کاتەدا لێی وەرگرتن کە لە بنەچەی ئادەمەوە وەری گرتن : " الافعال ٢ / ٤٥٧ "، لە لایەکی دیکەوە لێکدەدرێتەوە بەوەی " ئەو سروشتی بوونەیە کە منداڵی پیێ لە دایك دەبێت لە سکی دایکیدا : تهذیب اللغة ١٣ / ٢٢٢ و لسان العرب ٥ / ٥٦ " . هەروەها " ئەو سروشتی بوونەی کە هەموو بوونەوەرێك لە سەرەتای دروست کردنیدا لەسەری دەبێت و، ئەو سروشتە دروستەی کە تێکەڵ بە خەوش و کەموکووڕی - عیب - نەبووە : المعجم الوسیط ٢ / ٦٩٤ "، لەم خوێندنەوەیەدا " سروشتی بوون " بەرانبەر بە وشەی " الفطرة " پێشنیاز کراوە .
٤٧. البخاري، ١٢ / ٤٦٥، ح ١٣١٩، مسلم ٤ / ٢٠٤٧، ح ٢٦٥٨، المسند المستخرج ٣ / ٩و ١٠، ح ٢٠٦٢، ابن حیان ١ / ٣٣٦، ح ١٢٨، سنن ابي داود ٤ / ٢٢٩، ح ٤٧١٤، سنن البیهقي الکبرى ٦ / ٢٠٢، الترمذي ٤ / ٤٤٧، ح ٢١٣٧ .
٤٨. لە بناغەدا بە حەزرەتی ئیبراهیم (ع) دەگوترێ " حنیف - حەنیف " و بە دینەکەی دەگوترێ " حنیفی - حەنیفی "، هەروەها پێشی دەگوترێ " مسلم - موسڵمان "، پاشتر هەردوو ناوەکە بۆ ئایینی ئیسلام / یش بەکار

هێنرا .

٤٩. مسلم ٤ / ٢١٩٧، ح ٢٨٦٥، ابن حیان ٢ / ٤٢٦، ح ٦٥٤، سنن النسائي الكبرى ٥ / ٢٦، ح ٨٠٧٠، المعجم الاوسط ٣ / ٢٠٦، ح ٢٩٣٣، المعجم الكبير ١٧ / ٣٥٨، ح ٩٨٧، مسند ابن حنبل ٤ / ٢١٦٢، ١٧٥١٩، مسند البزاز ٨ / ٢٤١٩، ح ٣٤٩١، مسند الطيالسي ١ / ١٤٥، ح ١٠٧٩ .

٥٠. بەپێی ئەو سەرچاوانەی بە چاپكراوی لەمڕۆماندا هەن پێ دەچێ " موحاسیبی "ی مامۆستای بەرچاوی قوتابخانەی صۆفیگەریی بەغدا، یەكەمین كەس بێت كە بە كۆمەڵێك كتێبی بەنرخ باسی لەم لایەنە گرنگە كردبێت، لەوانە : " الرعاية --> ----> لحقوق الله "، " رسالة المسترشدين " و " فهم الصلاة " و ... تاد، " ابو طالب المكي " ش لەژێر كاریگاریی ئەو و لەسەر بناغەی هەمان میتۆد كتێبی " قوت القلوب فى معاملە المحبوب و وصف گریق المرید الی مقام التوحید " ی نووسیوە . ئیمامی " ئەبو حامیدی غەزالی " لەبارەی " موحاسیبی " یەوە گوتوویەتی : " موحاسیبی، رەحمەتی خوای لێ بێ، باشترین كەسی ئوممەتە - ئیسلام - لە مامەڵەكان - المعاملات - دا و، پێش هەموو ئەو كەسانە كەوتووە كە بە دوای عیبەكانی نەفس و نەخۆشییەكانی كردەوەكان و قووڵایی ئەركەكانی خواپەرستیدا گەڕاون و، قسەشی شایانی ئەوەیە وەكو خۆی بگێڕدرێتەوە " احیاء علوم الدین، بیان ذم الغنى ومدح الفقر، ٣ / ٢٦٤" .

٥١. لە پەراوێزی ئەم بەیتەدا مامۆستایان ئاماژەیان نەكردووە بۆ ئەوەی ئەو " لە پێشە كارە هات " ە دەبێ چۆن بنووسرێ، ئەگەرچی بۆشایی " سپەیس " لە نێوان " كارە " و " هات " دا دانراوە، بەلاّم لە لێكدانەوەكەدا، كە بەم شێوەیەیە : " بەلاّم هاتنی یار وا دەگەیەنێ كە دڵ ئەركی گەورە و كاری زۆری دەكەوێتە بەر "، ئەمەش بەو مەعنایەیە كە

بۆشایی نەخرێتە نێوان " کارە " و " هات " ەوە، واتە بەو شێوەیە : " کارەهات "، کە کورداندنی " کارمات " ی فارسییە و مەعنای " کارەکانت " یان " ئەرکەکانت " دەبەخشێ . بەلای منەوە ئەمە پتر لەگەڵ گیانی گشتیی بەیتەکەدا دەگونجێ .

٥٢. لە " دیوانی مەحوی " دا " جونوون ئاداب " لەبری " جونوون ئاباد " تۆمار کراوە و، لە پەراوێزدا نووسراوە : " لە چەند نوسخەیەکیشدا لە جیاتیی ( جونوون ئاداب ) نووسراوە ( جونوون ئاباد ) . – پەراوێزی ئەو بەیتە، ل ١٨ " بەلای منەوە " جونوون ئاباد " پتر لەگەڵ میتۆدی صۆفیگەریدا دەگونجێت، بۆ زانیاریی زیاتر، بڕوانە: عەبدوڵڵا قەرەداغی، لە پەراوێزی یەکەمین لێکدانەوەی ( دیوانی مەحوی ) دا، بەشی یەکەم، گۆڤاری ئێستا، ژ ٢٢، مایسی ١٩٩٩، ل ١٠ و ١١ .

٥٣. خودی وشەی ( عشق) لە رووەکێك وەرگیراوە کە پێی دەگوترێ " عشقة " و بە دەوری رووەکی دیکەدا دەئاڵێت و خۆراکەکەی هەڵدەمژێت و سیسی دەکات . بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە : عەبدوڵلا قەرەداغی، چەمکی عیشق لە شیعرەکانی مەحویدا، گوڤاری رامان، ژ ٦ و ٧، کانوونی یەکەمی ١٩٩٦ و کانوونی دووەمی ١٩٩٧ .

٥٤. بۆ هەمان ئەو مەبەستەی ئایەتی ( البقرە ٦٠ ) دەتوانرێ سەرنج بدرێتە ئایەتی ( الاعراف ٧ ) یش

٥٥. هەمان شێوەی بەکارهێنانی ئەو وشەیە لە ئایەتی ( القصص ٣١ ) یشدا هەیە .

٥٦. وشەی " عیّار – عەییار "، لە زمانی عەرەبیدا بە جموجووڵەوە بەستراوەتەوە، چ خێرایی بێت و چ زۆر جووڵان . زۆربەی فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبی هاوبۆچوونن لەسەر ئەوەی عەییار " پیاوێکی زۆر هاتوچۆ

کەرە لە زەویدا و، لەوانەیە شێریش بەوە ناو ببرێت بەهۆی زۆر هاتوچۆ کردنی بە دوای بێچیردا : لسان العرب ٤ / ٦٢٢، مختار الصحاح ١ / ١٩٤، القاموس المحیط ١ / ٥٧٤، المحکم و المحیط الاعظم ٢ / ٢٣٥ "، هەروەها بۆ ستایش کردن - پیا هەڵدان - و خراپە گوتن / یش بەکار دەهێنرێ، دەگوترێ : " لاوێکی عەییار " بەو مەبەستەی چالاك بێت لە سەرپێچی کردن - المعصیه -، یان چالاك بێت لە ملکەچی بۆ خوا : لسان العرب ٤ / ٦٢٣ "، تهذیب اللغة ١ /٢٤٦ "، هەروەها " عەییار لە پیاوان ئەو کەسەیە کە جڵەو بۆ ئارەزووەکانی شل دەکات و سەرکوتیان ناکات و نایان تۆرێنێ : المصباح المنیر ٢ / ٤٤٠ و المغرب فی ترتیب .... ٢ / ٩٢ ". لە رووی زاراوەشەوە لە بناغەدا بە چەمکی " الفتوة - جوامێری " یەوە بەستراوەتەوە، کە " شێوازیکی پەروەردەیی کۆنە، لە کۆتایی سەدەی دووەمی کۆچییەوە هەیە و، عەیارەکان رێورەسم و بنەمای تایبەتیان لە ژیاندا هەبووە، کە وردە وردە تێکەڵ بە صۆفیگەری بووە و لە شێوەی - جوامێری - دا بەرجەستە بووە " پرنسیپەکانی جوامێریش سێ خاڵن : یەکەمیان ئەوەیە ئەوەی دەیڵێی بیکەی . دووەم ئەوەی لە قسە و کردەوەتدا راستی بپارێزی . سێیەمیش ئەوەیە کە بە کردەوە ئارام بیت : فرهنگ معین، دوره چهار جلدی ٣ / ١٩٥٤ " .

٥٧. بەو شێوەیەی ئەو بەیتە هەر شێوازی بانگ کردن " نداء " ە عەرەبییەکەیە، بەڵام لەنێو خەڵکە ساویلکەکەی کۆمەڵی کوردەواریدا زۆر جار، بە هەڵە، بۆ فریا کەوتن بەکار دەهێنرێ، کە دەگوترێ : " یا شێخ ... "، دیاریشە کە چاوەڕوانیی فریاکەوتن لە " سەلملندنی پایە بۆ بانگ کراو " ەوە دێت .

٥٨. بە رواڵەت هاودژییەك بەدی دەکرێ لەنێوان دووپات کردنەوەی ئەوەی

کـە شـاعیر خـۆی گوتوویـەتی " لـە رووسـووریی عیبـادەت لام و رووزەردی خەجاڵەت مام " و ئەمەی لێرەدا دووپات دەکرێتەوە، بەڵام وا نییە، چـونکە یەکێك لە بنەما هەرە گرنگەکانی صۆفیگەری ئەوەیـە کـە خـاوەن ئـەزموون دەبـێ گومـانی بـە خـودا زۆر بـاش و بـە خـۆی زۆر خـراپ بێـت . "الـسري السقطي " ی مامۆستای سلووکیی جونەیدی بەغدادی، سەرەڕای ئەو هەموو لە خوا ترسان و پایە بەرزییەی لێی دەگێڕنەوە . دەڵێ : " حـەز ناکـەم لـە شوێنێکدا بمـرم کـە تێیـدا دەناسـرێم نـەبا زەوی قـەبووڵم نـەکات و ئـابڕووم بچێ، التعرف لمذهب ..، ٣٤ " .

٥٩. وشەی " مضغة "، لە زمانی عەرەبیدا، لـە بناغـەدا، مـەعنای " پـاروو "، " ئەو بڕە خۆراکەی بە یەك جار لە دەمدا جێی دەبێتەوە " دەبەخشێ، بـەڵام فەرهەنگـەکانی ئـەو زمانـە مـەعنای " پارچـە گۆشـتێك " یـشیان بـۆ سەلماندووە، بۆ ئەم فەرموودەیەش ئەو مەعنایە دەگونجێ .

٦٠. سنن الـدارمي، ٢ / ٢١٩، ح ٢٥٣١، کـشف الخفـاء ١ / ٤٣٨، ح ١١٦٧، کتب و رسائل و فتاوی ابـن تیمیـة ٢٥ / ٣١٧ و ٢٩ / ٣١٥ و.... تـاد . ئـەو فەرموودەیە لە بواری گومانزاکان – الشبهات – دایە و ئەوەی هێنراوەتـەوە بەشێکێتی کە لە " سنن الدارمی " دا ئاوەهایە : " وان في الجسد مـضغة اذا صلحت صلح الجسد کله و اذا فسدت فسد الجسد کله، الا و هي القلب "

٦١. ناتوانرێ بە راستی بزانرێ ئەم دوو بەیتە هی کێن . هێنـدێك بـە هـی " رابیعەی عەدەوی "دەزانن : مرقاة المصابیح ٩ / ٢١٤، تـاریخ مدینـة دمـشق ٦٩ / ١١٨ . خـەڵکانی دیکـە بـە هـی " عەبـدوڵلای کـوڕی موبـارەك " ی دەزانن : تفسیر الثعلبي ٣ / ٥١ و دیوان ابن المبارك، ٩ . هـەروەها دەدرێتـە پاڵ ئیمامی شافعی، دیوان الامـام الـشافعی / ٦٧ و الاداب الـشرعیه / ١٧٩، یان محمود الوراق : فوات الوفیات ٢ / ٤٦٩، یـان محمـد بـن الحنفیـە، شـعب

الايمان ١ / ٣٨٦ و تهذيب الكمال ٦ / ٣٢٠، يان ئەبو بەكرى شيبلى، قاعدة في المحبة / ٧٣ . زۆر سەرچاوەش هەن دەيدەنە پاڵ پتر لە كەسێك يان نايدەنە پاڵ هيچ كەسێك، بەڵام هەموويان زياتر بە هى شاعيرێكى صۆفى يان دەست لە دنيا داشۆردوو – زاهد – لە قەڵەمى دەدەن . دووەمين بەيتى ئەو دووبەيتە لە هەموو سەرچاوەكاندا هەر بەو شێوەيەيە كە نووسراوە، بەڵام يەكەمين بەيت، بە تايبەت دووەمى بەشى .. واتە " عەجز " ەكەى، بە چەندين شێوەى جياواز هاتووە .

٦٢. زۆر گەڕاوم بە دواى ئەوەى ئايا ئەمە فەرموودەيە يان نە ، هيچم بۆ يەكلا نەبووەوە، واتە پێ ناچێ فەرموودە بێت، بەڵام لە قسەيەكى ديكەوە نزيكە، كە گوايە فەرموودەى قودسييە و دەڵێ : " لم تسعني ارضى و لا سمائي و وعني قلب عبدي المؤمن الوادع "، يان بە شێوەيەكى نزيك لەوە و، لە زۆر كتێبى ئەو بوارەدا هێنراوەتەوە وەكو " احيط علوم الدين ٣ / ١٥، الشقائق النعمانيه ١ / ٤٧٤، الوابل الصب / ٤٢، جامع العلوم والحكم ١ / ٣٦٥ و ٣٩٨، المدهش ١ / ٣٢٧ و ٣٨٥، تەفسيرى " روح المعانى "، ٣ / ١٧٣، ١٤ / ٤٥، ١٧ / ١٥٩ و ... تاد . ئەم فەرموودەيەش لە لايەن كەسانى وەكو زەركەشى و عراقى و ابن تيميه / وە رەت كراوەتەوە كە فەرموودە بێت : الفوائد الموضوعة في الاحاديث الموضوعة، ٢٠٢، احاديث القصاص ، ٦٧، الاسرار المرفوعة ..، ١ / ٣١٠ و ٣٧٦، اللؤلؤ الموضوع ١ / ١٦٥، المصنوع ١ / ١٦٤، اسمى المطالب ١ / ٢٥٢، الجد الحثيث ١ / ٢٠١، المقاصد الحسنة ١ / ٤٨٩، ح ٩٩٠، كشف الخفاء ٢ / ٢٥٥، ح ٢٢٥٦، بەڵام " ابن تيميه "، سەرەڕاى ئەوەى بە " ئيسرائيليات "ى دادەنێ، لەو رووەوە بە گونجاوى دەزانێ كە مەعناى " خۆشەويستى و ناسين و پەرستنى منى خستۆتە دڵيەوە . بڕوانە : الفتاوى الكبرى ٢ / ٣٣١ و، منهاج السنة النبوية

٥ / ٣٧٨ و ٣٧٩ .

٦٣. ئـەوەی لـە نێـو خەڵکدا بـاوە ئەوەیـە کـە دەڵـێ : " النـاس سواسـية كأسنان المشط .."، كە لە كتێبە سەرەكییەكانی فـەرموودەدا نەمدۆزییـەوە و، لە چوار كتێبدا هەیە كە هەموویان سەر بە فیقهـی حەنـەفین و ئەمانـەن : المبسوط للسرخسی ٥ / ٢٣، تبيين الحقائق ٢ / ١٢٨، شرح فتـح القـدير ٣ / ٢٩٣ و مجمع الانهر في شرح ملتقى الابحر ١ / ٥٠١ . ئەسڵی فەرموودەكە بـەم شێوەیەیە " يا ايها الناس ان ربكم واحد وان اباكم واحد، ألا لا فضل لعربـي على أعجمي و لا لأعجمي على عربي و لا اسود على احمر و لا احمر على اسود الاّ بتقوى الله، مسند احمد بن حنبـل ٥ / ٤١١ ح ٢٣٥٣٦، مجمـع الزوائـد ٣ / ٢٦٦، كنز العمال ٣ / ٢٧٩ ح ٨٥٠٢، مجموعة الحديث ٣ / ١٩٩ ح ٥٣٦، فتح الباری ٦ / ٥٢٧ . جێی جەخت كردنە لەسەر ئەوەی كـە " النـاس سـواسـية كأسنان المشط " ناكۆكیی لەگەڵ ناوەڕۆكی فەرموودەكـەدا نییـە، بـەڵام لـە رووی زانـستی و لـە بـابی " خۆپـارێزی - الـورع " یـشەوە نـاكرێ قـسەی نەسەلمێندراو بەوەی كە ئەو فەرموودەیە، بدرێتە پاڵ پێغەمبەر (ص) .

٦٤. دەقەكەی لە : صحيح مسلم، ٤ / ١٩٩٩ ح ٢٥٨٦ دا ئاوەهایە : " مثـل المؤمنين في توادهم و تراحمهم و تعاطفهم مثلُ الجسد اذا اشـتكى منـه عـضوٌ تداعى له سائر الجسد بالسهر و الحمى " و، بەو شـێوەیە یـان بـە جیاوازیـی كەم لە چەندین كتێبی دیكـەی فـەرموودەدا بـڵاو كراوەتـەوە، وەكـو : سـنن البيهقي الكبرى ٣ / ٣٥٢ و ٣٥٣ ح ٦٢٢٤، المعجم الـصغير " الـروض الدانـي "، ١ / ٢٣٥ ح ٣٨٢، مسند ابن حنبل ٤ / ٢٧٠ ح ١٨٣٩٨، مـسند الـشاميين ١ / ٢٩٣ ح ٥١٢، مسند الـشهاب ٢ / ٢٨٣ ح ١٣٦٧، معجـم شـيوخ ابـی بكـر الاسماعيلي ١ / ٤٣٨ ح ٢٨، كنز العمال ١ / ٨٨ ح ٧٣٧، من حـديث خيثمـة ٧٤، شرح النووي على صحيح مسلم ١٦ / ١٣٨ ح ٢٥٨٦ و .... تاد .

٦٥. دەقەکەی بەم شێوەیەیە : " المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضا " : صحيح البخاري ١ / ١٨٢ و ٤٦٧ و ٢ / ٨٦٣ ح ٢٣١٤، ٢٢٤٢ و ٥٦٨٠، صحيح مسلم ٤ / ١٩٩٩ ح ٢٥٨٥، صحيح ابن حيان ١ / ٤٦٧ ح ٢٣١، سنن النسائي الكبرى ٢ / ٤١ ح ٢٣٤١، سنن البيهقي الكبرى ٦ / ٢٩٤ ح ١١٢٩١، سنن الترمذي ٤ / ٣٢٥ ح ١٩٢٨، سنن النسائي المجتبى ٥ / ٧٩ ح ٢٥٥٩، مصنف ابن ابي شيبة ٦ / ١٦٣ و ٧ / ٨٨ ح ٣٠٣٤٨ و ٣٤٤١٣، مسند الحميدي ٢ / ٣٤٠ ح ٧٧٢، المعجم الاوسط ٦ / ٣٥ و ٣٦ ح ٥٧١٨، مسند ابي يعلي ١٣ / ٢٧٩ و ٣٠٧ ح ٧٢٩٥ و ٧٣٢١ و ... تاد .

٦٦. وشەی " طريق " ی عەرەبی مەعنای " ڕێ - ڕێگە " دەبەخشێ، بۆیە ڕەنگە بتوانرێ بگوترێ کە مەبەست ئەوەیە یاران " ڕێگەی هودا " یان گرتۆتە بەر، نەك " تەریقەتی عیشق "، ئەمە ڕاستە، بەڵام لە بەیتی ( ٣ ل ٨ ) دا بە ڕوونی گوتراوە " ڕێگەی هودا طە ریقەتی عیشقە " واتە مەبەست هەردوکیانە، چونکە یەکن .

٦٧. ئەم بەیتە ئاماژەی تێدایە بۆ هەردوو ئایەتی پیرۆزی : وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَنْ فِي الْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ / يونس ٩٩ ) و إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ / القصص ٥٦ ) و بۆ ئەو فەرموودەیەش کە باسی " ابو طالب " ی مامی لای پێغەمبەر کرا، فەرمووی : " لەوانەیە شەفاعەتم بە کەڵکی بێت و لە ئاگرێکی تەنکدا دابنرێ کە بگاتە هەردوو قاپەڕەقەی و دەماخی پێی بکوڵێ - لعله تنفعه شفاعتي يوم القيامة فيجعل في ضحضاح من النار تبلغ كعبيه يغلي منه دماغه " : ئەم فەرموودەیە لە " ئەبوو سەعیدی خودری " یەوە گێڕدراوەتەوە و لە چەند کتێبێکی فەرموودەدا دیومە، لەوانە : مسند ابي عوانة ١ / ٩٢ ح ٢٨١، مصنف ابن ابي شيبة ٧ / ٥١ ح ٣٤١٣٥، فيض

القدير ١ / ٢٣٢ .

٦٨. عبدالكريم جيلى كتێبێكى هەيە بە ناوى " الانسان الكامل في معرفة الاواخر و الأوائل " هوە، كە تێيد كرۆكى ئەو بۆچوونەى خۆى لەبارەى " مرۆڤى تەواو " هوە دەخاتە روو كە " كۆمەڵە ئاماژە و ئاگادار كردنەوەيەكى تايبەتە لەسەر پلەى رەهاكراوى مرۆڤى تەواو كە ناتوانرێ ئەو ئاماژانە بخرێنە سەر كەس و ئەو عيبارەتانەش بدرێنە پاڵ كەس جگە لە موحەممەد (ص) " : الانسان الكامل، ٢٠٣ .

٦٩. بە پێچەوانەى ئەوەى لە لێكدانەوەى ديواندا بەديى دەكەين، پێم وايە رستەى " انني لراض – من رازيم " ئاماژەيە بۆ دەقێكى قورئانى پيرۆز، كە ئەو پەيمان و پابەندييە ئەزەلييەيە كە بەپێى ئەدەبياتى صۆفيگەرى، بەندەكان لە رۆژى ئەزەلدا بە خواى خۆيان داوە و، ألست بربكم ؟ " دا " قالوا بلى / الاعراف ١٧٢ " بۆتە بەڵگە و نيشانەى " رازى بوون " و " پابەنديى مرۆڤ "، هەر ئەمەش دەتوانرێ، بە راستى، بە " سەرنويشتى ئەزەل " ناو ببرێ، بە تايبەت لە روانگەى راستەقينەى ئەم بەيتەى " مەولەوى " يەوە :

٧٠. بە چەند شێوەيەك هاتووە، لەوانە : " سێ پاڕانەوە بێ گومان گيران – وەلاّم دەدرێنەوە – پاڕانەوەى ستەم لێ كراو و پاڕانەوەى رێبوار و پاڕانەوەى باوك لەسەر منداڵى : موارد الظمآن ١ / ٥٩٧ ح ٢٤٠٦، سنن ابن ماجة ٢ / ١٢٧٠ ح ٣٨٦٢، الادب المفرد ١ / ١٦٩ ح ٤٨١، مصباح الزجاجة ٤ / ١٤٩ ح ١٣٦٤ و مشيخة ابن البخاري ٢ / ٩١٧ . لە " فوائد ابن الماسى " دا لەبرى " باوك "، " رۆژووگر " ە : ١ / ٤٨ ح ١٢

٧١. پاڕانەوەى ستەم لێكراو بەسەر هەورەوە هەڵدەگيرێ و دەرگاكانى ئاسمانى بۆ دەكرێتەوە و خوداوەند دەڵێ : هەر سەرت دەخەم با هێندێك

درەنگیش بێت، صحیح ابن حیان ٣ / ١٥٨ ح ٨٧٤ و موارد الظمآن ١ / ٥٩٧ ح ٢٤٠٨ .

٧٢. بە دوو شێوە دیومە : " خۆت لە پاڕانەوەی ستەم لێ کراو بپارێزە چونکە پەردە لە نێوان ئەوە و خوادا نییە، سنن الترمذي ٤ / ٣٦٨ ح ٢٠١٤، مصنف ابن ابي شيبة ٦ / ٤٨ ح ٢٩٣٧١ و، لە " مسند الشهاب ١ / ٢٠٨ ح ٣١٥ و موطأ مالك ٢ / ١٠٠٣ " دا نووسراوە " گیرایە " .

٧٣. " لە پاڕانەوەی ستەم لێ کراو بترسن " : المطالب العالية ١٤ / ٢٩ ح ٣٣٧٧ .

٧٤. پێم وایە کە یەکەمین بەشی ئەو بەیتە ئاماژەیە بۆ ئایەتی پیرۆزی : ولَمّا جاءَ موسى لِمِيقَاتِنا وكَلَّمه رَبّه قَالَ ربِّ أرِني أنظُر إلَيك قَالَ لَن ترانِي ولَكِن انظُر إلى الْجبل فَإن استقَرّ مكانه فَسوف تراني فَلَمّا تجَلّى رَبّه لِلْجبل جعلَه دكًّا وخَرّ موسى صعِقًا فَلَمّا أَفَاق قَالَ سبحانك تبت إلَيك وأنا أوّلُ الْمؤمِنِ / الاعراف ١٤٣ )، واتە مەبەست " ڕووناکیی تەجەللی - دەرکەوتن - " ە . ئەگەرچی لە دووەمین بەشی بەیتەکەشدا دەڵێ " ئەشباە " واتە " هاوشێوە - نموونە " زۆرە .

٧٥. باشترە خوێنەر بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە بناغەییەکان، لەوانە : التعرف لمذهب اهل التصوف ل ٧٠ و ٧١، فوت القلوب .... ٣٥٩ تا ٣٧٥، الرسالة القشيرية ٢١٠ تا ٢١٤ . ٧٦. اللمع فی التصوف، ٢٥ .

٧٧. هێندێ جار، لە ڕووی بێ نرخ دانانیەوە، لە ئەدەبیاتی صۆفیگەریدا ئیحای ئەوە بۆ مرۆڤ دروست دەبێت کە ئەو وشەیە لە " دناءة - نزمی " یەوە وەرگیرا بێت، مەحوی / یش ئیحای ئاوەهای هەیە :

٧٨. ئەوە پتر لێچواندنی ئیمامی غەزالییە ( محمد بن محمد بن محمد بن حامد)، بۆ زانیاریی زیاتر لەبارەی دڵەوە لە ڕوانگەی صۆفیگەرییەوە،

باشترە خوێنەر بگەڕێتەوە بۆ چاپە پێنج بەرگییەکەی کتێبی " احیاء علوم الدین " . سەرچاوەی ئەو بۆچوونەی صۆفییان لەبارەی رەش داگەڕانی دلاّنەوە بە تاوان ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرە کە بە چەندین شێوە لە کتێبەکانی فەرموودەکاندا هاتووە ناسراوترینیان بەم شێوەیەیە : " ان العبد اذا اخطأ خطیئة نکتت فی قلبه نکتة سوداء، فإن هو نزع و استغفر و تاب صقلت قلبه و إن عاد زید فیها حتی تعلو قلبه : سنن النسائي الکبری ٦ / ٥٠٩ ح ١١٦٥٨ . هەروەها بڕوانە : سنن ابن ماجة ٢ / ١٤١٨،

[٧٩]. لە دیوانی شاعیردا بە ناحەق لە بریی وشەی " بەقا " وشەی " لیقا " دانراوە، ئەگەرچی لە پەراوێزی هەمان بەیتدا ( ل ١١٢ ) نووسراوە کە تەنانەت لە دەسنووسە پاکنووس نەکراوەکەی شاعیر خۆیشیدا " بەقا " ئەسڵە . بۆ راستیی ئەوەی " بەقا " بۆ ئێرە دەست دەدات نەك " لیقا "، بڕوانە : عەبدوڵلا قەرەداغی، لە پەراوێزی یەکەمین لێکدانەوەی دیوانی مەحویدا، گۆڤاری "ئێستا " ژ ٢٢، حوزەیرانی ١٩٩٩، ل ٩. [٨٠]. بە شێوەیەکی سەرەکی بڕوانە :الرسالة القشیریة، ١٠٢ تا ١٠٤، لەبەر گرنگیی ئەم مەسەلەیە و، بە مەبەستی خۆ دوور خستنەوە لە هەر جۆرە هەڵە تێگەیشتنێك باشترە خوێنەری بەڕێز بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە بناغەییەکانی بواری صۆفیگەری و، لەوانە کتێبەکانی : اللمع في التصوف/ ی " ابو نصر عبدالله بن علي السراج الطوسي " و " التعرف لمذهب اهل التصوف " ی " ابو طالب المکي " و " قوت القلوب " ی " محمد بن علي بن عطیة الحارثي – ابو طالب المکي " . شایانی جەخت لەسەر کردنە کە لە کتێبی " اللمع فی التصوف " دا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە، تەنانەت پێش کۆتایی پێ هاتنی چوارەمین سەدەی کۆچیش، خەڵکانێك هەبوون بە هەڵە لە چەمکی فەنا، بە تایبەت " فەنای بەشەرییەت " تێ گەیشتبوون . " اللمع فی التصوف، ٤٢٦

٨١. نازانم ئەم بەیتەم لە چ کتێبێکدا پێشتر خوێندبووە، بەڵام زۆر لە هەر شەش دەفتەرەکەی " مثنوی معنوی " و " کلیات شمس تبریزی " ی مەولانای رۆمیدا گەڕام و نەمدۆزییەوە . لە " ناڵەی جودایی " یەکەیدا هێمنی موکریانی/ ش هەمان بەیتی بەکار هێناوە .

٨٢. ئەو خاڵبەندییەی لە دیواندا بەدی دەکرێ بۆ ئەم بەیتە، لە سەرەتاویەوە، بەم شێوەیەیە : " چیە ؟ خوسران ... "، بەمەش " خوسران " دەبێتە وەڵام و ئەوی دیکەش : " مەستی لەهو و لەعبی دنیا بوون " دەبێتە بابەتی پرسیارەکە . بەلای منەوە " خوسران " بابەتی پرسیارەکەیە، واتە شاعیر دەیەوێ بڵێ " زیان کردن چییە ؟ "، وەڵامەکەشی ئەمەیە : " بەم رادەیە مەست - خولیا - ی گەمە و گاڵتەجاڕیی دنیا بوون " . لێکدانەوەکەی دیوانیش هەر وەهایە، واتە پێ دەچێ ئەو خاڵبەندییە هەڵەی چاپ بێت .

٨٣. دەقی قسەکە بە عەرەبی بەم شێوەیەیە : " التصوف الاعراض عن الاعتراض " : الرسالة القشيرية، ٣١٥

***

## سەرچاوەکان

القرآن الكريم

ابن ابي شيبة (ابو بكر عبدالله بن محمد الكوفي):

١. الكتاب المصنف في الاحاديث و الآثار، تحقيق: كمال يوسف الحوت، مكتبة الرشد، الرياض، ط ١ ، ١٤٠٩ هـ.

ابن تيمية (ابو العباس تقي الدين احمد بن عبدالحايم):
٢. احاديث القصاص، تحقيق: محمد الصباغ، المكتب الاسلامي، بيروت، ط١ ١٣٩٢ هـ - ١٩٧٢ م.
٣. الفتاوى الكبرى، تحقيق و تقديم: حسنين محمد مخلوف، دار المعرفة، بيروت.
٤. كتب و رسائل و فتاوى شيخ الاسلام ابن تيمية، تحقيق: عبدالرحمن بن محمد بن قاسم العاصمي النجدي، مكتبة ابن تيمية، ط٢
٥. منهاج السنة النبوية، تحقيق: د ز محمد رشاد سالم، مؤسسة قرطبة، القاهرة، ط١ ١٤٠٦ هـ.
ابن حجر (ابو الفضل احمد بن علي العسقلاني الشافعي):
٦. فتح الباري - شرح صحيح البخاري، تحقيق: محب الدين الخطيب، دار المعرفة، بيروت.
٧. المطالب العالية بزوائد المسانيد الثمانية، تحقيق: د. سعد بن ناصر بن عبدالعزيز الشتري، دار العاصمة، دار الغيث، الرياض ١٤١٩ هـ.
ابن حنبل (ابو عبدالله احمد الشيباني):
٨. مسند الامام احمد بن حنبل، مؤسسة قرطبة، القاهرة.
ابن حيان (ابو حاتم محمد بن حيان بن احمد التميمي البستي)
٩. صحيح ابن حيان بترتيب ابن بليان، تحقيق: شعيب الارنؤوط، مؤسسة الرسالة، بيروت ط٢ ١٤١٤هـ - ١٩٩٣ م.
ابن خزيمة (ابو بكر محمد بن اسحاق بن خزيمة السلمي النيسابورى):
١٠. صحيح ابن خزيمة، تحقيق: د. محمد مصطفى الاعظمي، المكتب الاسلامي، بيروت ١٣٩٠ هـ - ١٩٧٠ م
ابن عباد (الصاحب):

١١. المحيط في اللغة، (عن الموسوعة الشاملة).
ابن عبدالوهاب (محمد):
١٢. قسم الحديث - المعروف بمجموعة الحديث -، تحقيق: عبالعزيز بن زيد الرومي، د. محمد بلتاجي و د. سيد حجاب، مطابع الرياض، ط ١.
ابن القيم: (ابو عبدالله شمس الدين محمد بن ابي بكر الزرعي الدمشقي):
١٣. الوابل الصب، تحقيق محمد عبدالرحمن عوض، دار الكتاب العربي، بيروت ط١، ١٤٠٥ هـ - ١٩٨٥ م.
ابن كثير (ابو الفداء اسماعيل بن عمر الدمشقي)
١٤. تفسير القرآن العظيم، دار الفكر، بيروت ١٤٠١ هـ.
ابن ماجة (ابو عبدالله محمد بن يزيد القزويني):
١٥. سنن ابن ماجة، تحقيق: محمد فؤاد عبدالباقي، دار الفكر، بيروت.
ابن ماسي:
١٦. فوائد ابن ماسي، تحقيق: مسعد عبدالحميد محمد السعدني، أضواء السلف، الرياض ١٤١٨ هـ - ١٩٩٨.
ابن المبارك (عبدالله بن المبارك بن واضح)
١٧. الزهد، تحقيق: حبيب الرحمن الاعظمي، دار الكتب العلمية، بيروت.
١٨. مسند الامام عبدالله بن المبارك، تحقيق: صبحي البدري السامرائي، مكتبة المعارف، الرياض، ط١، ١٤٠٧ هـ.
١٩. ديوان ابن المبارك، عن " الجامع الكبير لكتب التراث العربي و الاسلامي ٢ "
ابن منظور (محمد بن مكرم الافريقي المصري):
٢٠. لسان العرب، دار صادر، بيروت ط١ ، ١٩٩٨.
ابو حبيب (د. سعدي):

٢١. القاموس الفقهي (عن موقع يعسوب).
ابو داود (سليمان بن الاشعث اليزدي السجستاني):
٢٢. سنن ابي داود، تحقيق: محمد محيي الدين عبدالحميد، دار الفكر بيروت.
ابو السعود (محمد بن محمد العمادي):
٢٣. ارشاد العقل السليم الى مزايا القرآن الكريم، دار احياء التراث العربي، بيروت.
ابو عوانة (يعقوب بن اسحاق الاسفراييني):
٢٤. مسند ابي عوانة، دار المعرفة، بيروت.
ابو يعلي (احمد بن علي بن مثنى التميمي الموصلي): مسند ابي يعلي، تحقيق: حسين سليم اسد، دار المأمون للتراث، دمشق ١٤٠٤ هـ - ١٩٨٤ م.
الازدي (محمد بن راشد):
٢٥. الجامع، تحقيق: حبيب الاعظمي، المكتب الاسلامي، بيروت، ط٢، ١٤٠٢ هـ (ملحق كتاب المصنف للصنعاني ج ١٠).
الازهري (ابو منصور محمد بن احمد):
٢٦. تهذيب الغة، تحقيق: محمد عوض مرعب، دار احياء التراث العربي بيروت، ط١، ٢٠٠١م.
الاسماعيلي (ابو بكر احمد بن ابراهيم بن اسماعيل):
٢٧. المعجم في اسامي شيوخ ابي بكر الاسماعيلي، مكتبة العلوم والحكم، المدينة المنورة، ط١، ١٤١٠ هـ.
الاصبهانى (ابو نعيم احمد بن عبدالله بن احمد بن اسحاق بن موسى بن مهران الهراني):
٢٨. المستند المستخرج على صحيح مسلم، تحقيق: محمد حسن اسماعيل الشافعي، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١، ١٤١٧ هـ، ١٩٩٦ م.

الآلوسي (ابو الفضل شهاب الدين السيد محمود البغدادي):

٢٩. روح المعاني في تفسير القرآن العظيم و السبع المثـاني، دار احيـاء الـتراث العربي.

الاندلسي (ابو محمد عبدالحق بن غالب بن عطية):

٣٠. المحرر الوجـيز في تفـسير الكتـاب العزيـز، تحقيـق: عبدالـسلام عبدالـشافي محمد، دار الفكر، بيروت، ط١، ١٤١٢ هـ - ١٩٩٣ م

انصارى (خواجه عبدالله):

٣١. كشف الاسرار و عـدة الابـرار - تحريـر ميبـدى -، باهتمـام: علـى اصـغر حكمت، تهران، چاپ ول، ١٣٤٤ هـ. ش.

البخاري (ابو عبدالله محمد بن اسماعيل الجعفي):

٣٢. الادب المفـرد، تحقيـق: محمـد فـؤاد عبـداباقي، دار البـشائر الاسـلامية، بيروت، ط٣، ١٤٠٩ هـ، ١٩٨٩ م.

٣٣. الجامع الصحيح المختصر، تحقيق: مصطفى ديـب البغـا، دار ابـن كثـير، اليمامة، ط٣، ١٤٠٧ هـ - ١٩٨٧ م.

بدوي (د ز عبدالرحمن):

٣٤. رابعة العدويـة، شـهيدة العـشق الالهـي، مكتبـة النهـضة العربيـة، القـاهرة، ١٩٦٢ م.

البزاز (ابو بكر احمد بن عمرو بن عبدالخالق):

٣٥. البحر الزاخر - المعروف بمسند البزاز -، تحقيـق: محفـوظ الـرحمن زيـن الله، مؤسسة علوم القرآن - مكتبة العلوم و الحكـم، ٣٦ - بـيروت - المدينـة المنورة، ط١، ١٤٠٩ هـ.

البغدادي (ابو الفرج زين الدين عبدالرحمن بن شهاب الدين):

٣٦. جامع العلوم و الحكـم في خمـسين حـديثا مـن جوامـع الكلـم، ت: شـعيب

الارنؤوط، ابراهيم باحس، مؤسسة الرسـالة، بـيروت، ط٧، ١٤١٧ هــ – ١٩٩٦ م.

البغوي (ابو محمد الحسين بن مسعود):

٣٧. معلم التنزيل المعروف ب " تفسير البغوي "، تحقيق: خالد عبدالرحمـن العك، دار المعرفة، بيروت.

البيضاوي (ناصر الدين ابو الخير عبدالله بن عمر بن محمد):

٣٨. تفسير البيضاوي، دار الفكر، بيروت.

البيهقي (ابو بكر احمد بن الحسين بن علي):

٣٩. الاربعـون الـصغرى، تحقيـق: ابـو اسـحاق الجـويني الاثـري، دار الكتـاب العربي، بيروت ١٤٠٨ هـ.

٤٠. سنن البيهقي الكبرى، تحقيق: محمد عبدالقادر عطا، مكتبة دار الباز، مكة المكرمة، ١٤١٤ هـ – ١٩٩٤ م.

٤١. شعب الايمان، تحقيق: محمد السعيد بسيوني زغلول، دار الكتب العلميـة، بيروت، ط١، ١٤١٠ هـ.

التبريزي (ابن الخطيب يحيى بن عيسى بن محمد):

٤٢. شـرح المعلقـات العـشر المـذهبات، تحقيـق: د. عمـر فـاروق الطبـاع، دار الارقم، بيروت ٢٠٠٧ م.

التبريزي (الخطيب محمد بن عبدالله):

٤٣. مشكاة المصابيح، تحقيق: محمد ناصرالدين الالباني، المكتب الاسـلامي، بيروت، ط٣، ١٩٨٥م.

الترمذي (محمد بن عيسى ابو عيسى السلمي):

٤٤. الجامع الصحيح – سنن الترمذي –، تحقيق: احمد محمد شاكر و آخرون، دار احياء التراث العربي، بيروت.

الثعلبي (ابو اسحاق احمد بن محمد بن ابراهيم النيسابوري):
٤٥. الكشف و البيان – تفسير الثعلبي –، تحقيق الامام ابي محمد بن عاشور، مراجعة و تدقيق: نظير الساعدي، دار احياء التراث العربي، بيروت، ط١، ١٤٢٢ هـ – ٢٠٠٢م.
الجوزي: (ابو الفرج عبدالرحمن بن علي بن محمد بن عبدالله بن هادي بن احمد بن محمد بن جعفر):
٤٦. المدهش، تحقيق: مروان قباني، دار الكتب العلمية، بيروت ١٤٠٥ هـ – ١٩٨٥ م.
الجيلاني (عبدالقادر):
٤٧. الفتح الرباني و الفيض الرحماني، تحقيق و ضبط: د. احمد عبدالرحيم السايح و توفيق علي وهبة، مكتبة الثقافة الدينية، القاهرة، ط١، ١٤٢٦ هـ – ٢٠٠٦ م.
الجيلي (عبدالكريم بن ابراهيم):
٤٨. الانسان الكامل في معرفة الاواخر و الاوائل، تصحيح و تعليق: فاتن محمد خليل اللبون فؤاد دكار، مؤسسة التاريخ العربي، بيروت، ط١، ١٤٢٠ هـ – ٢٠٠٠ م.
حافظ (لسان الغيب):
٤٩. ديوان حافظ، نسخهء قزوينى، غنى، با مجموعهء تعليقات و حواشي علامه: محمد قزويني، باهتمام: ع. جربزه دار، انتشارات اساطير، تهران، چاپ اول، زمستان ١٣٦٧ هـ. ش.
الحاكم (ابو عبدالله محمد بن عبدالله النيسابوري):
٥٠. المستدرك على الصحيحين، تحقيق: مصطفى عبدالقادر عطا، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١، ١٤١١ هـ – ١٩٩٠ م.

الحميدي (ابو بكر عبدالله بن الزبير):

٥١. المسند، تحقيق حبيب الرحمن الاعظمي  دار الكتب العلمية، مكتبة المتنبي، بيروت، القاهرة.

الحنفي (فخرالدين عثمان بن علي الزبلعي):

٥٢. تبيين الحقائق، شرح كنز الدقائق، دار المكتب الاسلامي، القاهرة ١٣١٣ هـ.

الدارمي (ابو محمد عبدالله بن عبدالرحمن):

٥٣. سنن الدارمي، تحقيق: خالد السبع العلمي، دار الكتاب العربي، بيروت، ط١، ١٤٠٧ هـ.

الرازي (فخرالدين محمد بن عمر التميمي الشافعي):

٥٤. التفسير الكبير، او مفلتيح الغيب، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١، ١٤٢١هـ – ٢٠٠٠م.

الرازي (محمد بن ابي بكر عبدالقادر):

٥٥. مختار الصحاح، تحقيق: محمود خاطر، مكتبة لبنان ناشرون، بيوت، ١٤١٥ هـ – ١٩٩٥م.

السخاوي (ابو الخير محمد بن عبدالرحمن بن محمد):

٥٦. المقاصد الحسنة في بيان الكثير من الاحاديث المشتهرة على الالسنة، تحقيق: محمد عثمان الحشت، دار الكتاب العربي، بيروت، ط١، ١٤٠٥ هـ – ١٩٨٥ م.

السرخسي (شمس الدين):

٥٧. المبسوط، دار المعرفة وبيروت.

سعدى (مصلح بن عبدالله):

٥٨. بوستان شيخ شيراز سعدي، تصحيح متن و شرح لغات: حسين استاد

ولي، انتشارات قدیانی، تهران، چاپ چهارم، ۱۳۷۷ هـ. ش.
٥٩. غزلیات شیخ شیراز سعدی، مقدمه و شرح: بهاء الدین اسکندری، انتشارات قدیانی، تهران، چاپ سوم، ۱۳۷۷ هـ. ش.
السعدي (ابو القاسم علي بن جعفر):
٦٠. الافعال، عالم الكتب، بيروت، ط١، ١٤٠٣ هـ – ١٩٨٣ – ٢٠٠٠.
السعدي (عبدالرحمن بن ناصر):
٦١. تيسير الكريم المنان في تفسير كلام المنان، تحقيق: ابن عثيمين، مؤسسة الرسالة، بيروت ١٤٢١ هـ – ٢٠٠٠م.
السمرقندي (ابو الليث نصر بن محمد):
٦٢. تفسير السمرقندي، تحقيق: د. محمود مطرجي، دار الفكر، بيروت.
السمعاني (ابو المظفر منصور بن محمد بن عبدالجبار):
٦٣. تفسير القرآن، تحقيق: ياسر بن ابراهيم و غنيم بن عباس غنيم، دار الوطن، الرياض، ١٤١٨ هـ – ١٩٩٧.
السيواسي (كمال الدين محمد بن عبدالقادر):
٦٤. شرح فتح القدير، دار الفكر، بيروت، ط٢.
السيوطي (جلال الدين عبدالرحمن بن الكمال):
٦٥. الدر المنثور، دار الفكر، بيروت، ١٩٩٣ م.
الشافعي (ابو عبدالله محمد بن ادريس – الامام):
٦٦. السنن المأثورة، تحقيق: د. عبدالمعطي امين قلعه جي، دار المعرفة، بيروت ١٤٠٦ هـ.
٦٧. ديوان الامام الشافعي (عن الجامع الكبير لكتب التراث الاسلامي والعربي ٢)
الشافعي (ابو القاسم علي بن الحسين ابن هبة الله بن عبدالله):

٦٨. تاريخ مدينة دمشق و ذكر فضلها و تسمية من حلها من الاماثل، تحقيق: محب الدين ابي سعيد عمر بن غرامة العمري، دار الفكر، بيروت، ١٩٩٥ م.
الشافعي (محمد بن درويش بن محمد الحوت البيروتي):
٦٩. أسمى المطالب في أحاديث مختلفة المراتب، تحقيق: مصطفى عبدالقادر عطا، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١، ١٤١٨ هـ – ١٩٩٧ م.
شايگان (داريوش):
٧٠. اديان و مكتبهای فلسفی هند، مؤسسه انتشارات امير كبير، تهران، چاپ دوم، ٢٥٤٦.
الشوكانى (محمد بن على بن محمد):
٧١. فتح القدير الجامع بين فني الرواية و الدراية، دار الفكر، بيروت.
شيخي زاده (عبدالرحمن بن محمد بن سليمان الكليبولي):
٧٢. مجمع الانهر في شرح ملتقى الابحر، تحقيق و تخريج احاديث: خليل عمران المنصور، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١، ١٤١٩ هـ – ١٩٩٨لام.
صفدي (مطاع) و حاوي (ايليا):
٧٣. موسوعة الشعر العربي (الشعر الجاهلي)، اشراف: د. خليل حاوي، تحقيق و تصحيح: احمد قدامة، شركة خياط، بيروت، ١٩٧٤ م.
طاشكبري زادة:
٧٤. الشقائق النعمانية في علماء الدولة العثمانية، دار الكتاب العربي، بيروت، ١٣٩٥ هـ – ١٩٧٥م.
الطبراني (ابو القاسم سليمان بن احمد):
٧٥. مسند الشاميين، تحقيق: عبدالمجيد السلفي، مؤسسة الرسالة، بيروت ط١، ١٤٠٥ هـ – ١٩٨٤م.
٧٦. المعجم الاوسط، تحقيق: طارق بن عوض الله بن محمد و عبدالمحسن بن

ابراهيم الحسني، دار الحرمين، القاهرة ١٤١٥ هـ.
٧٧. المعجم الصغير - الروض الداني -، تحقيق: محمد شكور محمود الحاج امرير، المكتب الاسلامي، دار عمار، بيروت ١٤٠٥ هـ - ١٩٨٥ م.
٧٨. المعجم الكبير، تحقيق: حمدي عبدالمجيد السلفي، مكتبة الزهراء، الموصل، ط٢، ١٤٠٤ هـ - ١٩٨٣م.
الطبري (ابو جعفر محمد بن جرير بن يزيد بن خالد):
٧٩. جامع البيان عن تأويل القرآن، دار الفكر، بيروت، ١٤٠٥ هـ.
الطرابلسي (محمد بن خليل بن ابراهيم المشيشي):
٨٠. اللؤلؤ المرصوع فيما لا أصل له أو بأصله موضوع، ، تحقيق: فواز احمد زمرلي، دار البشائر الاسلامية، بيروت، ط١ - ١٤١٥ هـ.
الطوسي (ابو نصر عبدالله بن علي السراج):
٨١. كتاب اللمع في التصوف، اعتنى بنسخه و تحقيقه: رنولد ألن نيكلسون، بريل، ليدن، ١٩١٤م.
الطيالسي (ابو داود سليمان بن داود الفارسي البصري):
٨٢. مسند ابي داود الطيالسي، دار المعرفة، بيروت.
الظاهري (جمال الدين احمد بن محمد بن عبدالله الحنفي):
٨٣. مشيخة ابن البخاري، تحقيق: د. عوض عتقي سعد الحازمي، دار عالم الفؤاد، مكة المكرمة، ١٤١٩ هـ.
العامري (احمد بن عبدالكريم بن سعودي الغزي):
٨٤. الجد الحثيث في بيان ما ليس بحديث، تحقيق: بكر عبدالله ابو زيد، الرياض، ط١، ١٤١٢ هـ.
العروسي (مصطفى):
٨٥. نتائج الافكار القدسية في بيان معاني شرح الرسالة القشيرية، ضبط و

تصحيح و تخريج الآيات و الاحاديث: الشيخ عبدالوارث محمد علي، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١، ١٤٢٠ هـ – ٢٠٠٠م.

العظيم آبادي (محمد شمس الحق):

٨٦. عون المعبود – شرح سنن ابي داود –، دار الكتب العلمية، بيروت، ط٢، ١٩٩٥ م.

الغزالي (ابو حامد محمد بن محمد):

٨٧. إحياء علوم الدين، دار المعرفة، بيروت.

الفراهيدي (الخليل بن أحمد):

٨٨. كتاب العين، تحقيق: د. مهدي المخزومي و د. ابراهيم السامرائي، دار و مكتبة الهلال.

الفيروزآبادي:

٨٩. تنوير المقباس من تفسير ابن عباس، دار الكتب العلمية، بيروت

الفيروزآبادي (محمد بن يعقوب):

٩٠. القاموس المحيط، مؤسسة الرسالة، بيروت.

الفيومي (احمد بن محمد بن علي المقري):

٩١. المصباح المنير في غريب الشرح الكبير للرافعي، دار الكتب العلمية، بيروت.

القاري (علي بن محمد بن سلطان المشهور ب – ملا علي –):

٩٢. الاسرار المرفوعة في الاخبار الموضوعة (الموضوعات الكبرى)، تحقيق: محمد الصباغ، دار الامانة، مؤسسة الرسالة، ١٣٩١ هـ – ١٩٧١.

٩٣. مرقاة المفاتيح – شرح مشكاة المصابيح –، تحقيق: جمال عيتاني، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١، ١٤٢٢ هـ – ٢٠٠١ م.

٩٤. المصنوع في معرفة الحديث الموضوع، تحقيق: عبدالفتاح ابو غدة،

مؤسسة الرسالة، ط٢، ١٣٩٨ هـ.

قەرەداغی (عەبدوڵڵا):

٩٥. پاشەڕۆژبینی لە روانگەی دوو شاعیری صۆفیی کوردەوە، گۆڤاری "گەلاوێژی نوێ"، ژمارە " ٢ "، تەمووزی ١٩٩٧.

٩٦. چەمکی عیشق لە شیعرەکانی " مەحوی " دا، گۆڤاری " رامان "، (١-٢)، ژمارە " ٦ "، ٥ ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٦، (٢- ٢)، ژمارە " ٧ "، کانوونی دووەمی ١٩٩٧.

٩٧. لە پەراوێزی یەکەمین لێکدانەوەی " دیوانی مەحوی " دا، گۆڤاری ئێستا، بەشی یەکەم، ژمارە " ٢١ "، مایسی ١٩٩٩، و بەشی دووەم، ژمارە " ٢٢ "، حوزەیرانی ١٩٩٩.

القرطبي (ابو عبدالله محمد بن احمد الانصاري):

٩٨. الجامع لاحكام القرآن، دار الشعب، القاهرة.

القشيري (ابو القاسم عبدالكريم بن هوازن):

٩٩. الرسالة القشيرية، تحقيق و وضع الحواشي: خليل المنصور، دار الكتب العلمية، بيروت، ط٣، ٢٠٠٥م - ١٤٢٦ هـ.

القضاعي (ابو عبدالله محمد بن سلامة بن جعفر):

١٠٠. مسند الشهاب، تحقيق: حمدي عبدالمجيد السلفي، مؤسسة الرسالة، بيروت، ١٤٠٧ هـ - ١٩٨٦.

الكتاني (احمد بن ابي بكر بن اسماعيل):

١٠١. مصباح الزجاجة في زوائد ابن ماجة، تحقيق: محمد المنتقى الكشناوي، الدار العربية، بيروت، بيروت، ١٤٠٣ هـ.

الكتبي (محمد بن شاكر بن احمد):

١٠٢. فوات الوفيات، تحقيق: علي محمود بن يعوض الله و عادل احمد

عبدالموجود، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١، ٢٠٠٠ م.
الكلاباذي (تاج الاسلام ابو بكر محمد):
١٠٣. التعرف لمذهب اهل التصوف، تحقيق: د. يوحنا الحبيب صادر، دار صادر، بيروت، ط٢، ١٤٢٧ هـ – ٢٠٠٦ م.
الكلبي (محمد بن احمد بن محمد الغرناطي):
١٠٤. التسهيل لعلوم التنزيل، دار الكتاب العربي، بيروت، ط٤، ١٤٠٢ هـ – ١٩٩٣ م.
مالك (ابو عبدالله مالك بن انس الاصبحي):
١٠٥. موطأ الامام مالك، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي، دار احياء التراث العربي، القاهرة.
المحاسبي (ابو عبدالله الحارث بن اسد):
١٠٦. رسالة المسترشدين، تحقيق و تخريج احاديث و تعليق: عبدالفتاح ابو غدة، اعتنى بطبعه و اخراجه: سلمان بن عبدالفتاح ابو غدة، مكتبة المطبوعات الاسلامية، بيروت، ط١١، ١٤٢١ هـ – ٢٠٠٠ م.
١٠٧. الرعاية لحقوق الله، شركة القدس للطباعة و النشر، جمادي الآخرة ١٤٢٩ هـ – مايو (ايار) ٢٠٠٨م.
١٠٨. المسائل في اعمال القلوب و الجوارح، وضع الحواشي: خليل عمران المنصور، منشورات محمد علي بيضون لنشر كتب السنة و الجماعة، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١، ١٤٢١ هـ – ٢٠٠٠ م.
المحلي (عبدالرحمن بن ابي بكر) و السيوطي:
١٠٩. تفسير الجلالين، دار الحديث، القاهرة، ط١.
مەحوی (مەلا موحەممەدی کوڕی مەلا عوثمانی باڵخی):
١١٠. دیوانی مەحوی، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی: مەلا عبدالکریمی مدرس و

محمدى مەلا كريم، كۆڕى زانياريى كورد، بەغدا، ١٣٩٧ هـ – ١٩٧٧ م.
المطرزي (ابو الفتح ناصرالدين بن عبدالسيد بن علي):
١١١. المغرب في ترتيب المعرب، تحقيق: محمود فاخوري و عبدالحميد مختار، مكتبة اسامة بن زيد، حلب – سوريا –، ط١ ١٩٧٩ م.
المقدسي (ابو عبدالله محمد بن مفلح):
١١٢. الآداب الشرعية و المنح المرعية ، تحقيق: شعيب الارنؤوط و عمر القيام، مؤسسة الرسالة، بيروت، ط٢، ١٤١٧ هـ – ١٩٩٦ م.
المرسي (ابو الحسن علي بن اسماعيل):
١١٣. المحكم و المحيط الاعظم، تحقيق: عبدالحميد هنداوي، دار الكتب العلمية، بيروت ٢٠٠٠م.
مسلم (ابو الحسين مسلم بن حجاج القشيرى النيسابوري):
١١٤. صحيح مسلم، تحقيق: محمد فؤاد عبدالباقي، دار احياء التراث العربي، بيروت
مصطفى (ابراهيم)، الزيات (احمد)، عبدالقادر (حامد) و النجار (محمد):
١١٥. المعجم الوسيط، تحقيق: مجمع اللغة العربية، دار الدعوة.
معين (د. محمد):
١١٦. فرهنگ معين، (دوره ٤ جلدى)، انتشارات زرين، تهران، با همكارى انتشارات نگارستان كتاب، تهران، چاپ اول، ١٣٨٢ هـ. ش.
المكي (ابو طالب محمد بن عطية الحارثي):
١١٧. قوت القلوب في معاملة المحبوب و وصف طريق المريد الى مقام التوحيد، ضبط و تصحيح باسل عيون السود، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١، ١٩٩٧ م.
المناوى (زين الدين عبدالرؤوف بن تاج العارفين بن زين العابدين الحدادي):

١١٨. الاتحافات السنية بالاحاديث القدسية، تحقيق: محمد عفيف الزعبي، مؤسسة الرسالة، بيروت.
مەولەوی (عبدالحیمی کوڕی سەعید):
١١٩. دیوانی مەولەوی، کۆکردنەوە، لێکۆڵینەوە و لەسەر نووسینی: مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم، پێداچوونەوەی: محمدی مەلا کەریم، (سوود لە چاپەکەی بلاوکراوەی کوردستان، سنە، ١٣٧٨ هـ. ش) وەرگیراوە.
نالی (مەلا خدری ئەحمەدی شاوەیسی مکایەڵی):
١٢٠. دیوانی نالی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی: مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم، پێداچوونەوەی: محمدی مەلا کریم، کۆڕی زانیاریی کورد، بەغدا، ١٩٧٦.
النسائي (ابو عبدالرحمن أحمد بن شعيب):
١٢١. المجتبى من السنن، تحقيق: عبدالفتاح ابو غدة، مكتب المطبوعات الاسلامية، حلب - سوريا -، ط٢، ١٤٠٦ هـ - ١٩٨٦.
١٢٢. السنن الكبرى، تحقيق: عبد الغفار سليمان البنداري، سيد كسروي حسن، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١، ١٤١١ هـ - ١٩٩١ م
النسفي (حافظ الدين ابو البركات عبدالله بن احمد بن محمود):
١٢٣. مدارك التنزيل و حقائق التأويل، تحقيق: مروان محمد الشعار، دار النفائس للطباعة و النشر و التوزيع، بيروت، ١٩٩٦.
النووي (ابو زكريا يحيى بن شرف بن مري):
١٢٤. صحيح مسلم بشرح النووي، دار احياء التراث العربي، بيروت، ط٢، ١٣٩٢ هـ.
الهندي (علاءالدين علي المتقي بن حسام الدين):

١٢٥. كنز العمال في سنن الاقوال و الافعال، تحقيق: محمود عمر الدمياطي، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١، ١٤١٩ هـ – ١٩٩٨ م.

الهيثمي (ابو الحسن علي بن ابي بكر):

١٢٦. مجمع الزوائد و منبع الفوائد، دار الريان للتراث، دار الكتاب العربي، القاهرة، بيروت، ١٤٠٧ هـ.

١٢٧. موارد الظمآن الى صحيح ابن حيان، تحقيق: محمد عبدالرزاق حمزة، دار الكتب العلمية، بيروت.



**سوپاس و پێزانین**

**سوپاس و پێزانینم بۆ هەموو**